زنجیرە کتێبی سەرکەوتنی بێسنور

# توانا کانت بە ئاگا بێنەو ئاینده دروست بکه





نوسینی:
د. ئیبراهیم ئەلفەقی

لەعەرەبییەوە:
جەبار تەنیا

دەروونناسی

# تواناکانت بەئاگا بێنەو ئاییندە دروست بکە

نووسینی: د. ئیبراهیم ئەلفەقی

وەرگێڕانی: جەبارتەنیا

چاپی یەکەم

٢٠٠٩

## پێناسی کتێب

ناوی کتێب: تواناکانت بەئاگا بێنەو ئایندە دروست بکە

نووسینی:ئیبراهیم ئەلفەقێ

بابەت:دەروونناسی

وەرگێڕانی: جەبار تەنیا

تایپ: وەرگێڕ

نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم ۲۰۰۹

چاپ: چاپخانەی چوارچرا

تیراژ: ۱۰۰۰دانە

ژمارەی سپاردنی (۱۳۵٦)

## دەسپێك:

لەساڵی ١٩٤٨کۆمەڵێك لەزانایانی پسپۆڕی چینەکانی زەوی، ڕۆشتن بۆ ئەفریقا بۆ گەڕان بەدوای ئەڵماس و بەردە نایابەکاندا، لەنێویاندا زانایەکی ژاپۆنی بەناوی(یوکی) تەمەن ٣٠ ساڵ پڕاوپڕ لەجۆش و خرۆش ناسراو بەکەسێکی بوێرو سەرەڕۆ.

بەیانیان زو لەخەون بێدار دەبویەوە بۆئەوەی دەستبکات بەگەشتە ڕۆژانەکەی بۆ گەڕان بەدوای ئەڵماس و بەردە نایابەکان ئێوارانیش کاتژێر دە دەگەڕایەوە بۆ هۆتێلەکەی.

ڕۆژان ڕۆشت و(یوکی) هیچ شتێکی دەسگیرنەبوو شایانی باسبێت، دوای دو هەفتە بڕیاری گەڕانەوەیدا بەرەو ژاپۆن، چونکە نائومێدیەکی زۆری توش بوبو، ئەمەش یەکەمین جارێك بوو لەژیانیدا دەست لەئامانجێك بشوات، کۆتا ڕۆژی لەکاتژێر پێنجی ئێوارەدا دەستی لەکار هەڵگرت، بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ هۆتێلەکەی پێویستیەکانی ئامادە بکات بۆ گەڕانەوەی بەرەو وڵاتی خۆی، لەڕێگە چاوی بەمناڵێکی تەمەن شەش ساڵان کەوت، بەردێکی سورسورهێنەری جوانی بەدەست مناڵەکەوە بینی، دوایلێکرد بەرامبەر بەهەندێك شیرینی ئەو بەردەی بداتێ، مناڵەکەش قایل بوو بەردەکەی پێداو(یوکی) بەرەو هۆتێلەکەگەڕایەوە، لەوێ خستیە ژێر میکرسکۆبی تایبەتی ئەو بوارەو دەستیکردە لێکۆڵینەوە، چەند جارێك بڕوای بەچاوەکانی خۆی نەکرد، پشکنینەکانی تاقیکردەوە، دوای چەندین جار دوبارە کردنەوەی

بۆیدەرکەوت لەهەمووژیانیدا شتێکی لەوجۆرەی نەبینیوەکەنرخەکەبگاتە دەملیون دۆلار.
پاشان لەتوێژینەوەکەیدا نوسی ئەو منالەخاوەنی گەورەترین سەروەت بوو، بەلام نرخەکەی نەدەزانی بەهەرزان فرۆشتی، ئەگەر دەرکی بەبەهای ئەو بەردە بکردایە هەرگیز بەو هەرزانیە نەیدەفرۆشت گەربیزانیبا بۆ هەتایی ڕزگاری دەبوو خۆیشیو بنەماڵەکەیشی لەهەژاریو نەداری ڕزگاریان دەبوو.
من خودی خۆم دەڵێم:
**زۆرێک لەخەڵکی پەی بەنرخی تواناکانیان نابەن ئەوەی خوای گەورە پێی بەخشیون، کاتیان بەهەدەر ئەدەن، یان ژیانیان یان خۆیان بەهەرزان دادەنێن، وەک ئەو منالەڕاستەقینەی ئەوەی ناودەستەکانی خۆی نەدەزانی.**
ئەم ڕاستەقینەیە چیرۆکێکم بیردێنێتەوە کەبەرلەدوهەزار ساڵ زیاتر بڕویداوە، کاتێ هەندێك لەگەورە پیاوانی چینیەکان کۆبونەوە، بڕیاندا پەیکەرێکی ئالتونی دروست بکەن، کەکێشەکەی زیاتر لەپێنج تۆن ببێت، مەبەستیش لەدروستکردنی بێتە کەلتورێکی چینو مێژو لەبارەیەوە بدوێت، گەشتیاران بێن بۆسەیرکردنی لەهەموو شوێنەکانی جیهانەوە، بۆیە دەسبەکاربونو پەیکەرەکەیان دروستکرد.
دوای ئەوەی پەیکەرەکەیان تەواو کرد، سوپایەك بەناوی بێرمۆد هێرشی کردە سەر ئەوشارەی پەیکەرە ئالتونیەکەی تێدابوو، ئەوسوپایە بەسوپایەکی دڕندە ناوبانگی دەرکردبوو، گەر هێرشیان بۆ هەرگوندو شارێك بکردایە سەرجەمیان دەکوشتو خانو ماڵیان وێران

دەکـرد، بۆیــە ڕابــەرە چــینیەکان ترسـێکی گــەورەیان لێ نیــشت، بۆیــە بڕیارنـدا پەیکەرەکـەڕوپۆش بکـەن بـەقوڕ بۆئـەوەی نـەزانرێت ئـەم پەیکـەرە ئاڵتونیــــە، بۆیـــە دەســــبەکاربوون لەڕوکەشـــکردنی بـــەقوڕ، پاشـــان سوپاکەهێرشـی کـردە سـەرئەو شـوێنەو بـەلای پەیکەرەکـەدا نەچـوون، چـونکە دەیـانزانی ئـەوە پەیکـەرێکی قوڕینـەو هـیچ بایـەخێکی نیـە، ڕۆژان ڕۆشـــتو پەیکەرەکەبەشـێوەی قـوڕاوی خـۆی مایــەوە دوای ١٥٠ سـاڵ بەســـەر ئـــەو کــارەدا، دەســـەڵاتدارانی چــین بڕیاریانــدا بیگوێزنــەوە بــۆ پــەکینی پایتــەخت، لــەوێ وەك کــەلتورێکی نەتــەوەیی پارێزگــاری لێبکــەن، بێئەوەی بزانن چی لەناواخنی ئەو پەیکەرەدایە.

بۆیــە کەرەســـتەی بــەهێزیان بــۆ ئامــادەکردو بــەرزیان کــردەوە بۆســەر گوێزەرەوەیـەکی بـەهێز بۆئـەوەی بگەیەننـە پایتـەخت، ئـەزمونێکی قـورس بــوو بەلایانـــەوە، کەشـــو هەوایــەکی ســاردو بــارانێکی بــەخوڕ دایکــرد، پەیکەرەکـەی خوسـاند، گەورەکـەیان فـەرمانی وەسـتاندنی ئـەو کارەیـدا، وازیــان لێهێنــا بــۆڕۆژی دووەم، تــاکو بارانەکـەخۆش بکـان، ئـەم ڕابـەرە بەساڵاچـووە زۆر زرنـگ بـوو، بـۆی لایتێکـی هێنــاو لەوشــەوەدا بــەوردی تەماشــای پەیکەرەکــەی کــرد بــڕوای نــەدەکرد بــەخۆی چــی دەبینێــت، چـونکە قـوڕ بـەڕوناکی هـیچ تیـشکێك ناداتـەوە، بۆیـە چـەکوشو قەڵـەمێکی هێنــاو کەلەبەرکــەی گــەورەکردو بەمــەش بریــسکانەوەکەی زیــادی کــرد ئەمــەش وای لەڕابەرەکـەدەکرد زیـاتر سـوربێت لەسـەر داتاشـینی قوڕەکـە، دوایــی داوایکــرد ڕابــەرەکانی دیکــەش هاوکــاری بکــەن، بۆیــە هــەموویان هــاتنو پەیکەرەکـەیان بەتـەواوی لەقوڕەکـەن پـاککردەوە، دوای دە کاتـژێر لـــەکارکردنو مانـــدوبونێکی زۆر هـــەموو بەسەرســـامیەوە ســـەیری

پەیکەرێکی ئاڵتونیان دەکرد، نرخەکەی لەهیچ ئەقڵێکدا جێی نەدەبویەوە، هیچ شتێکی هێندە نایابو ئەنتیکەیان لەسەردەمی خۆیاندا نەدیتبوو.

پەکەرێکی ئاڵتونیان لەناو بەرگێکی قوڕاویدا دۆزیبۆوە نرخەکەی بێسنور بوو، بۆیە هەموودەزگاکانی هەواڵیان لێ ئاگادار کردەوە کاربەدەستان هاتنە نێو مەسەلەکەوە، جەختیان لەوە کردەوە ببەن بۆ پایتەخت بۆئەوەی سەرنجی گەشتیاران کێش بکات، ئێستا ئەو پەیکەرە لەچیندا هەر ماوە، ئەم چیرۆکەپەندێکی چینی لەسەر دانراوە.

## لەنێو قوڕدا گەنجینەی خشڵ هەیە.
## منیش بەخەڵکی دەڵێم: لەناخی هەرکەسێکدا گەنجینەیەکی خشڵ هەیە لەتواناکانی خوای گەورە بۆی داناوە.

وەك خوای گەورە دەفەرموێت: وفي أنفسكم أفلا تبصرون

بەلام خەڵکی بەدوای ئەوەی ناخی خۆیاندا ناگەڕێن بۆ ئەوەی توانا راستەقینەکانیان بدۆزنەوە، چونکە ژینگەکەیان دەوردراوە بەو زانیارانەی پێشتر بەرنامەڕێژی کراوە لەجیهانە دەرەکیەکان، بیروڕاکانیان هەستە سلبیەکان، سەرەتای ئەم بەرنامە ڕیژیە(داتا) کردنەش لەباوانەوەیە، پاشان ژینگەی خێزانی، پاشان ژینگەی، کۆمەلایەتی، پاشان ژینگە قوتابخانە، ئەنجا هاوڕێ، دوایش هۆکانی ڕاگەیاندن، وێڕای ئەمانەش بەها دینیو مێژوییو جوگرافیەکانە، زیاترلە٩٠٪ لەبەها سۆزداریەکانمان لەجیهانە دەرەکیەوە وەرمانگرتوە، بۆیە داتامان دەکات بەشێوازێکی نیگەتیڤانە، لەم سۆنگەیەشەوە

هەنـدێك توێـژەر لەكۆلێـژی پزیـشكی"سـان فـران سیـسكۆ" هەسـتان بەتوێژینەوەیـەك لەچـۆنیەتی داتـای مرۆیـی، بۆیاندەركـەوت زۆربـەیان نیگەتیڤـەو لـەدژمان كـار دەكـەن، هـیچ نـین جگـە لەڕوپۆشـێكی بـیروڕاو، هەسـتو، پـەیبردنو توانـا بێـسنورەكانمان، بەتـەواوی وەك پەیكـەرە چینیەكەی بەقوڕ سواغ درابوو كەلەناواخنیدا بەهایەكی بێسنوری هەیە.

بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: وفي أنفسكم أفلا تبصرون

خـوای گـەورە دەیـەوێت سـەرنج لـەناخی خۆمـان بـدەین، نەكەوینـە ژێـر كاریگـەری (داتـا)ی نیگەتیڤـەوە لـەجیاهنی دەرەكـی، پەیبـە بـەها جـوانو ڕاستەقینەكەمان بەرین.

خـوای گـەورە توانـای ئـەقڵی پـێ بەخـشیوین بـۆ توێژینـەوەو شیكاركردن، داهێنـان، دۆزینـەوە بۆئـەوەی بـڕوای بتـەوی پـێ بێـنین، زیـاتر گوێڕایـەڵی فەرمانەكانی بین، زیاتر پەیوەست بین پێیەوە.

بائێـستا هەنـدێك لـەتواناكانمان بپـشكنین، بێگومـان تواناكانمـان لـەوە زیـاترن كـەدەركمان پێكـردوون، موداكانیـان نـازانین، هێنـدە نـەبێت خـوای گـەورە ئـەقڵی پـێ بەخـشیوین كـەتوانای ڕۆچـونو دۆزینـەوەو بەڵگەی بونیات نانی هەیە.

- بابـە ئـاوەزی مرۆیـی دەسـت پێبكـەین ئـەوەی خـوای گەرە بەهۆیەوە ڕیزی لێناوین:

ئـاوەزی مرۆیـی ١٥٠ ملیـار خانـەی ئـەقڵی لـەخۆگرتوە، دكتـۆر "هیربـێرت سبنـسر" لـەزانكۆی "هارفـارد" لەوڵاتـە یـەكگرتوەكانی ئـەمریكا لەتوێژینـەوەی ئـاوەزی مرۆیـداو لـەكتێبی" چـارەو توانـای بێـسنور" دەڵێ:

گەر دەست بکەین بەژماردنی ژمارە ١ تاکو دەگەینە ١٥٠ ملیار ئەوا پێویستمان بە ٥٠٠٠ ساڵە!!! بێنە بەرچاوی خۆت!!! ئاوەزی مرۆیی تواناکانی بێسوورن، زاناکان لەساڵەکانی پەنجاکانی ئەم سەدەیە وتیان: ئێمە وەك مرۆڤ ٥٠٪ لەتوانا ئاوەزییەکانمان بەگەڕخستوە، لەشەستەکاندا وتیان: ٢٠٪ وەگەڕخستوە، لەحەفتاکاندا وتیان: ١٠٪ وەگەڕخستوە، لەهەشتاکاندا وتیان٥٪ لەنەوەدەکاندا وتیان: ١٪، کەچی ئێستا، لەکتێبی یەکێك لەلێکۆلەرە ئەمریکیەکان بەناوی The SIXE''F''s'' نوسەر دەڵێت:ئێمە "١,٠٪" مان وەگەڕخستوە لەتواناکانی ئاوەزی مرۆیی.

بەڵام زاناکان کۆکنین لەسەر ئەوڕێژەیە دەڵێ١٠٪ مان وەگەڕخستوە.

گەر بێتو ڕای زاناکان وەرگرین بەوەیکە١٠٪ مان وەگەڕخستوە، بەرێژەیەش ئەم هەموو پێشکەتنە بەرچاویەیانەی هەموو بوارەکان پزیشکیو دەرونیو مرۆیی ئەلکترۆنیدا، ئەی چی دەڵێیت گەر لە١٥٪ یان٢٠٪ یان چی دەبێت گەر ٥٠٪ بخەینە گەڕ لەتوانا ئەقلیەکان. یان ئەگەر ١٠٠٪ توانا ئەقلیەکانمان دۆزیەوەو پەیمان بەنهێنیەکانی بردو هەموو تواناکانمان دۆزیەوە.

ئەم بیرکردنەوەیە بۆخۆتی بەجێ دێلم، بەڵام دڵنیابە ڕێژەی بەکارهاتوی ئێمە لە١٪ تێپەڕ ناکات لەئێستادا!!!

دکتۆر هیربیرت بەردەوام دەبێت لەسەر توێژینەوەکانی لەئاوەزی مرۆڕیدا، دوپاتی دەکاتەوە کەئاوەزی مرۆیی دەتوانێت سەرنجی لەسەر حەوت زانیاری چڕ بکاتەوە جادانەیەك کەمتر بێت یان زیاتر، ئەقلی نائاگا دەتوانێت پێشوازی بکات لەدوملیۆن زانیاری لەچرکەیەکدا،

چـــونکە خێرایـــی بیرکردنـــەوەی مـــرۆڤ زیـــاترە لـــەخێرایی تیـــشك کەخێراییەکەی لە١٨٦ هەزار میل زیاترە لەچرکەیەکدا.

بـەڵام لـەبارەی ئـەنبار کردنـی یـادەوەری مرۆییـەوە لەهـەموو خانەیـەکی ئەقڵیـدا ملیۆنێـك خانـەی بـچوکتر هەیـە پێـی دەوترێـت( سـنابرز) لەهـەموو(سـنابرز) ێکـدا ملیۆنێـك خانـەی ئـەنبار کـردن هەیـە، گەربمانـەێت بیانژمێرین.

ملیۆنێـــك بـــدەین لـــەملیۆن پاشـــان کـــەرەتی ١٥٠ ملیـــاری بکـــەین ئەنجامەکـەی قـەبارەی یـادەوەری مرۆڤێکـی ئاسـایی دەبێـت، سـەیریش لەوەدایـە هەنـدێك کـەس بـەخۆیان دەڵـێن: توانـای بیرکردەوەمـان لاوازە: بیرکردنـەوەی لاوازە!!! بـەڵکو نازانێـت بیرکردنـەوەی ئـاڵۆزەو بەشـپرزی بیرلەکۆمـەڵێك شـت دەکاتـەوە لەیـەك کـاتی دیـاریکراودا، نازانێـت ئـەقڵ مامەڵەلەگـەڵ تـەنها شـتێکدا دەکـات لەیـەك کاتـدا، دوای ئـەوە دانەیـەکیتر پاشـان دانەیـەکیتر، کەچـی ئـەم لەیـەك کاتـدا لەگـەڵ کۆمـەڵێك شـتدا تێهەڵدەچـێت، ئەمـەش دەبێتـە هـۆی ئـاڵۆزی، هاوکـات بیرکردنـەوە لـەم نێوەندەدا بێتاوانەی هیچی لەئەستۆدا نیە.

گـەر بمانـەوێ بەچڕوپڕی بـاس لەئـەقڵی مـرۆڤ بکـەین پێویـستی بـەکتێبێکی گەورەیـە تـاکو وشـەکانی لـەخۆ بگرێـت بـەڵام لێـرەداو لـەم کتێبەدا هێندەمان بەسە.

ئێستا گەر بمانەوێ لەچاوەکان وردبینەوە:

دەبیـنین توانـای ئـەوەیان هەیـە١٠ ملیـۆن ڕەنـگ جیـا بکەنـەوە بـەبێ بیرلێکردنـەوە، هـەردوکیان لێـك دەنـرێن، دەکرێنـەوە، نزیکـەی ١٨٠٠٠جـار

لەرۆژێکـدا، بـۆ ئـەوەی ئـەو وزە کارۆموگناتیـسیەی هەیـەتی بپارێزێـت، لێرەشـەوە بەئاشـکرا دەبینرێـت، ئـەو ترشـەڵۆکەی دەریـدەدات لەشـێوەی فرمێـسکی سـوێردا بـۆ ئـەوەی بـەرگری بکـات لەهـەر میکرۆبێـك یـان زیندەوەرێك کەبیەوێت شالاوی بۆ ببات.

کەواتـە سـەرنجێك بـدە لـەو شـێوە ئەندازیاریـەی لەئەفرانـدنی تـۆدا خـوای گـەورە ئەفرانـدویەتی ئەمـەش شـتێکی سـادەیە لەچـاوەکانداو توانـا بێسنورەکانیان.

بابچینە سەرباسی(لوت):

ئـەمیش ئـەتوانێت جیاکـاری بکـات لـەنێوان ٢٠٠٠ بۆنـدا، هاوشـان توانایـەکی بێـسنوری هەیـە لـەپالاوتنی ئوکـسجین لەهـەر پـیس بونێـك و گەیانـدنی بەهـەر شـوێنێکی پێویـستی لـەش، هـەروەها دەمو زمـان، تواناکانیـان لەناسـینەوەی تـامو چـێژی خـواردنو خواردنەوەکانـدا، ددانـەکان بۆشـت وردکـردنو جـوین، لیـك و هاوکاریـە نایابەکـەی لـەهاوکاری کردنـی کۆئەنـدامی هەرسـدا، هـەروەها دەنگـە ژێکـانو توانـای لەرینـەوەکانیان بۆئەوەی ووتەکانت بەشێوازێکی دروست لەگەروت بێنە دەر.

ئەمانـەش سـەرجەم پـەرجوی خـوای گـەورەن بـۆ بـەدیهێنراوەکانی، لەگـەڵ هـەموو ئەمانەشـدا باسمـان لەپێـستو مـوو نـەکرد....رونکردنـەوەکانی دیکـە... دڵ١٠٠٠٠جـار لەرۆژێکـدا لێـدەدات بێنـەوەی تـۆ هەسـتی پێبکـەیت، جگـەرو، گورچـیلەکان، سـپڵ، گـەدە..هـەموو شـتێکی نـاوەکی پەرجویـەکی بێـسنورن، هەریەکـەو کـاری خـۆی ئـەنجام ئـەدات بەوردبینیـەکی تـەواوەوە، هـەروەها هـەموویان وەك

تیمێکـی پێکـەوە گرێـدراو لەوردەکاریـدان بەسیـستمێکی گـەورە کەبەلگـەی بەدیهێنەرێکی گەورەن.

گەرلـەبارەی گـەورەیی بەدیهێنـەرەوە بـدوێین هێـشتا هیـچمان پێناکرێـت وەك خوی دەفەرموێت:

وإن تعدوا نعمة الله لاتحصوها

هـەروەها خـوای گـەورە لەسـەر جـوانترین شـێوە ئەفرانـدوینی، هـەموو شـتێکی گـەرسونی بـۆ ملکـەچ کـردوین‌و کردوینـی بەجێنـشین لەسـەرزەوی، لـەڕۆحی خـۆی تێکـردوین، بەهەشـتێکی بـۆ ئامـادە کـردوین پانتاییەکـەی هێنـدەی پانتـایی ئاسمانـەکان‌و زەویـە، خۆشویـستنی خوداش بیری مرۆڤ بەرەو بالآ دەبات.

هـەموو ئـەم قـسانە هێـشتا هـەقی خۆتـت نادەنـێ تـەنها بەشـێکی کـەمن لـەجوانی ئەفرانـدنی تـۆ توانـا بێـسنورەکانت، کەواتـە شانبەشـانم بیربکەرەوە:

سوپاس بۆخوا، سوپاس بۆخوا، سوپاس بۆخوا.

بڕیامـدا بـۆ نوسـینی ئـەم کتێبـەو نـاو بنـێم:" تواکانـت بـەئاگا بێنـە، ئایندەت دروست بکە"

کردمە بەدوبەشەوە:

بەشـی یەکـەم: تواکانـت بـەئاگا بێنـە، تیایـدا توانـا بێـسونەرەکانت ببینـە خـوای گـەورە پێـی بەخـشیویت، بزانـە تـۆ گـەورەو بـەهێزیتریت لـەو ئاستەنگو پێشهاتانەی لەژیاندا هەیە.

بەشی دووەم: ئایندەت دروستبکە...ئەم بەشە جەخت لەوەدەکاتەوە چۆن تواناکان بخەیتەگەڕ، بۆئەوەی ئامانجەکانت بپێکیت‌و ئایندەیەکی پرشنگدار دروست بکەیت.

بالێت بپرسم:

- ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە لەو ڕاستەقینەیە تێبگەیت تۆ کێیت؟
- ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە توانا بێسنورەکانی خۆت بزانیت؟
- ئایا کاتی ئەوە نەهاتوەدەست هەڵگریت لەگومانبونت بەرامبەر بەتواناکانت؟
- ئایا کاتی ئەوە نەهاتوەدەسبەرداری سکاڵاو لۆمەکردن‌و ڕەخنەو بەروارد بێنیت؟
- ئایا کاتی ئەوە نەهاتوەبزانیت چۆن مامەڵەلەگەڵ دزانی خەونەکانتدا دەکەیت؟
- ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە بەوترسەی نێو چاوەکانت بڵێیت:چیتر بەسەو لێمگەڕێ باائامانجەکانم بەدی بێنم؟
- ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە بەخوای گەورە بڵێیت: ئەی پەروەردگار لێم ببورە لەنەفامیەکانم ببورە، لەنەزانینم بە بەخشینەکانت، لەتواناو هێزە بێسنورەکەی تۆ بێئاگا بووم.
- بەڵێن بەخوای خۆت بدە، پەی بەتواناکانی خۆتبەریت، پەی بەخودی ڕاستەقینەی خۆت بەریت، پاشان بەڵێن بدە هەموتواناکانت بەگەڕبخەیت بەباشترین شێوە.
- ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە ئەو قورەی پێی ڕوکەشکراویت لەخۆتی بکەیتەوە، واتە ئەو داتا سلبیەی لەکۆنەوە پێی داتا کراویت؟

لێبوردە بیت بەرامبەر بەخەڵکی؟

دێوە زمەکەی ناخت وەدەر بنێیت؟

- ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە نرخی ئەو ئەڵماسەی نێو دەستەکانت بزانیت؟
- ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە ئایندەیەك بۆ خۆت دابرێژیت؟

لەگەڵ مندا دوبارەی بکەرەوە:

هەر ئێستا...... هەرئێستا

لەگەڵ مندابە بۆئەوەی بابەقوولایی ناخی مرۆڤایەتیدا شۆڕببینەوە نایابیەکەی بدۆزینەوە.

لەگەڵ مندابە باگەشتێك بکەین بۆناوەوە، بۆئەوەی بینەری سەمەرەکان‌و پەرجوەکانی پەروەردگار بین.

وەرەو لەگەڵ منبە لەرێگەی ڕاپەڕین ...ڕێگەی سەربەستی.. ڕێگەی سەرکەوتن‌و کامەرانی.

دلنیابە:

کاتی ئەوەیە: تواناکانت ڕاچڵەکێنیت، داهاتویەك دروست بکەیت.

## بەشی یەکەم :
## تواکانت بەئاگا بێنە

بسم الله الرحمن الرحيم
وفي انفسكم أفلا تبصرون

## تواناكانت بەئاگا بێنە

کاتێ دەرك بەتوانا بێسنورەکانی مرۆڤ دەکەین، پاشان لەوە تێگەشتین گەر وەك پێویست بیانخەینە گەڕ، ئەوا بێگومان دەبین لەمسۆگەر کردنی ئامانجەکان، بەخەونەکانمان دەژین، گەشتی ژیانیش پڕ دەبێت لەخۆشیو کامەرانی.

**بانێستا بپرسم:**

گەر بەڕاستی خاوەنی ئەوتوانایانەبین، پاشان هەموو ئاواتەکانمان بەدیهێنا، لەناخەوە بەئاسودەیی ژیاین بەخۆشیو سەرکەوتنی بەردەوام، گەر ئەمە ڕاستەقینەیەکی حاشاهەڵنەگربێت، بۆچی زۆربەی خەڵکی ئاواتەکانیان نامێننەدی؟

بۆچی زۆربەی خەڵکی لەگێژاوی ئاستەنگەکاندا دەژین؟

بۆچی خۆیان بەهەرزانترین نرخ دەفرۆشن؟

وەڵامیش بۆ ئەم پرسیارانە لەوشەیەکی کورتدا خۆی کۆدەکاتەوە ئەویش نەبونی تێگەیشتن.

تێنەگەشتنی مرۆڤ خۆی بەبەهێزترو باشتر لەوە دەزانێت کەبەبیریدا دێت. تێنەگەشتن لەوبەرنامەڕێژییە سلبیەی لەکۆنەوە بەرنامەڕێژی لەسەرکراوە لەجیهانەکەی دەرەوە.

تێنەگەشتن لەوەیبەئاکارەکانی، بەڕەنگو شێوەی، بەپلەو پایەی، بەخێزانەکەی ناخەملێنرێت بەڵکو باشترین بەدیهێنراوی خوای پەروەردگارە.

بەکورتی: پەینەبردن بەنرخ و بەهاڕاستەقینەکەی خۆی.

با لێرەدا چیرۆکێکی ڕاستەقینەت بۆبگێڕمەوە کەخۆم لەگەڵ ڕوداوەکانیدا ژیاوم ئەزمونێکی زۆرم لێوەرگرتوە لەبارەی پەیبردنەوە:

جارێکیان بانگهێش کرام بۆلێدوانێك لەمۆنتریال، کاتێ سواری ئۆتۆمبێلەکەم بووم ویستم بیخەمەگەڕ، لەجێی خۆی جوڵەی نەکرد، زیاتر گوشارم کردە سەر پێگازەکەی، بەڵام بێسود بوو، مەکینەکەی دەنگی زیاتر دەبوو بەڵام نەدەجولا، دابەزیم و پەیوەندیم بەپسپۆڕانی ئۆتۆمبێلەکەوە کرد، لەماوەی کەمتر لەنیو کاتژێر ئامادە بوون لەناکاو سەرنجی ئەوەیاندا من بریکم دانەدابویەوە، بۆیە ئۆتۆمبێلەکەنەدەجولا بەهۆی بریکێکەوە،کتومت وەك زۆرێك لەخەڵکی بریکی وەستاندنی ئاوەزیان بەکار بردوە، ئەقڵیان وەستاندوە لەئاستی بیرکردنەوەو تواناو ئەگەری پێشکەوتن و پەرەسەندن، ئەمەش بیرکردنەوەی سلبی و بنەمای سلبیە سەبارەت بەخۆیی و خەڵکی تەنانەت سەبارەت بەهەموو دنیا، ئەمانە دەبنە ئاستەنگی پێشکەوتن.

بەڵام ئەوەی شایانی خۆشیە ئەمەیە من و تۆو هەموو خەڵکی سەر زەوی دەتوانێ ئەو ئاستەنگانە پوچەڵ بکاتەوەتواناکانی بەکاربیات، ئامانجەکانی بپێکێت.

بەر لەوەی باسی لەسەربکەین باجۆرەکانی ئەو ئاستەنگە خودیانە دیاریبکەین، کەدەبنە هۆی ئەوەی زۆربەی خەڵکی تواناکانی خۆیان نەخەنە گەڕ.

ئاستەنگی
بڕوبیانوو

ئاستەنگی
داناى پێشو
پێشو

ئاستەنگی
فاکتەرە
دەرەکیەکان





لەو ئاستەنگانە
ڕێگە لەبەکاربردنی
تواناکان دەگرن





ئاستەنگی
نارەزایی

ئاستەنگی
خۆنرخاندن

ئاستەنگی
وێنەی خودی

## ئاستەنگی بیانو:

### ئاستەنگی حاڵەتی دەرونی:

لێرەدا چیرۆکی ئافرەتێك دەگێڕمەوە، مامۆستایەکی سەرکەوتو دڵخۆش بەکارەکەی، ژیانێکی ئاسایی و سەقامگیری تەواوی هەبوو، چوبویە هاوسەرگیریەوە خاوەنی سێ منداڵ بوو، پاشان ناکۆکیەکی ئاسایی رویدا لەنێوان خۆی و بەڕێوەبەرەکەیدا، تاوایلێهات توانای چونەوە سەرکاری نەما، هەموو تەرکیزەکانی چڕکردەوە لەسەر ئەم ناکۆکیەو بەدەست لەکارکێشانەوەی گەیاند، ئەمانەش هەمووی بەهۆی تاکەکەسێکەوە، بەڕێوەبەری قوتابخانەکەی. ! !

کاتێ دەست بەتاڵ بو لەماڵەوە مایەوە دڵخۆش بوو بەم بارو دۆخە نوێیە، گرنگی خستە سەر منداڵەکان و مێردەکەی، ماوەیەك بەردەوامی لەسەر ئەم حاڵەوەرگرت ئیدی وردە وردە هەستی بەبێزا بوون دەکردو تاکو گەیاندیە حاڵەتی خەمۆکی، چیتر نەیدەتوانی بچێتەوە سەرکارەکەی، واینەدەزانی هەرگیز رۆژێك لەرۆژان کاری کردبێت، بەلام ناکۆکیەکەی لەگەڵ کەسێکدا وایلێکرد بیر لەهیچ نەکاتەوە تەنها لەکێشەو تەنگەژەکان نەبێت، ئەم تەرکیزکردنە پەرێشانی کردو گۆڕیە سەر حاڵەتێکی دەرونی، پاشان بەحاڵەقایل بوو، دوایی دەقیگرت بەو حاڵەوەو کردیە بیانویەك بۆخۆی.. بیانوی حاڵەتی دەرونی.

**بیانوی بارودۆخی خێزانی:**

زۆرێـك لەخـەڵكمان بیـستوە: بـاوكم هـەرگیز منـی خـۆش ناوێـت، دایكم هەرگیز ڕێزم لێناگرێت..یان..یان خوشكو براكانم گوێم پێنادەن.

هەنـدێك دەڵـێن: بـاكو دایكـم بەشـێوازێكی دروسـت پـەروەردەی منالەكانیان نەكردوە.

منـیش دەڵـێم: تـەنها بـاوكو دایكـێكم نیـشانبدە ڕاهێنانیـان لەسـەر پـەروەردەی منـاڵ كردبێـت، پەروەردەیـەكی دروسـتی منالـەكانیان كردبێت.

لەوانەیـە هەنـدێك بڵـێن: بـارودۆخی خێزانـی مـن زۆر قـورس بـووە، پەروەروەدەیـەكی خـراپ كـراووم، تـێم هەڵـدراوە، سـوكایەتیم پێكراوە...هتد

كـچێكی تەمـەن ١٩ سـاڵ سـەردانی كـردم بـۆ نوسـینگەی ڕاوێژكاریەكـەم، دەگریـا، گریـانێكی نائاسـایی، كاتـێ باسـی بـاوكی دەكـرد تەنانـەت وتـی: زۆر ڕقـم لێیـەتی، بەرگـەی نـاگرم، خۆكـوژیم پێباشـترە لـەم حالەم، زۆریش هەوڵی خۆكوژیداوە لەبەر توندو تیژی باوكی.

جارێكیـان چـاووم بـەباوكی ئـەو كـچە كـەوت لەیـەكێك لەكۆڕەكانمـدا، هەركـەبینیمی دەسپێـشخەری كـردو وتـی: زۆر پێویـستم بەتۆ هەیە بۆ ئـەوەی هاوكـاریم بكـەیت لـەو كێشەیەدا، مـن دەمـەوێ زیـاتر لەكـچەكەم نزیـك بمـەوە، بـەڵام ئـەو ڕوم تێناكـات منـیش نـاتوانم بـەوجۆرە مامەڵەی لەگەڵ بكەم.

بڕوانـە ئـەو دەیـەوێ بەپـەڕی توانایـەوە ئـەركی خـۆی جێبـەجێ بكـات لەهەموو حالەتێكیدا ئەو باوكە.

کچەکەش حەزی لەدورکەوتنەوەیە، حەزی بەچونەدەرەوەیە حەزدەکات درەنگ بچێتەوە بۆ ماڵ، بیری ڕاستەقینەی نەدەکردەوە، لەوانەکانیدا دەرنەدەچوو، چاوەڕوانی هیچ شتێکی ئەرێی نەدەکرد تەنها لەنەرێکان پێشوازی دەکرد، گوایە باوکی دەیەوێت کۆتو بەندی بکات، یان توندو تیژ بێت لەگەڵیدا.

پەنای بردویە بەر ئەم بیانوە وایدەبینی لەسەرکەوتن دوای دەخات لەژیانیدا ئەمەش بیانوی دۆخی خێزانیە.

## بیانوی دۆخی کۆمەڵایەتی:

زۆرێک لەخەڵکی دەڵێن: من ناتوانم مامەڵەلەگەڵ خەڵکیدا بکەم.. یان کەسێك منی خۆش ناوێت..یان کەس بەهیچم نازانێت...هتد

باڵێرەدا بپرسم:

ئایا تۆ کەسێکی کۆمەڵایەتیت؟

دەبینیت هەندێکجار دەڵێت: پێشتر کەسێکی کۆمەڵایەتی بووم، بەڵام ئێستا وانیم!

گەر لێیان بپرسیت: بۆچی؟

دەڵێت: پێشتر هەندێك لەهاوڕێکانی خیانەتیان لێکردوە، گاڵتەیان پێکردوە، سوکایەتیان پێکردوە، هاوشێوەی ئەم بیانوانە، بۆیە بڕیاری ئەوەی داوە پاشەکشێ بکات لەهەموو هاوڕێیەتیەکان، تاگەشتۆتە ئەوەی لەڕوبەڕو بونەوەی خەڵکی ئەترسێت.

تاکو گەشتۆتە ئەو قۆناغەی دوچاری ترسی کۆمەڵایەتی بوە، ئەم بیانوەشی کردۆتە بیانوی دۆخی کۆمەڵایەتیەوە هەمیشە ئاستەنگن لەبەردەم پێشکەوتنەکانیدا.

## بیانوی دۆخی پیشەیی:

هەندێك كەس لەوبڕواخودیەدان لەكارەكەی دەردەكرێت، بۆیە لەسەر هیچ كارێك بەردەوام نابێت، هۆكارەكەشی هەستێكی وەهای لادروست بوە خۆی بەكەمبزانێت لەچاو ئەوانەی كاری لەگەڵدا دەكەن.

لەبری ئەوەی ئاستی خۆی باش بكات ئەمە دەكاتە دۆخێكی پیشەییو دەیكاتە ئاستەنگی پێشكەوتنەكانی.

## بیانوی دۆخی دارایی:

لەوانەیە ئەمە سواوترین ووشەی سەرزاری خەڵكی بێت ئەویش: من پارەم نیە، هیچ توانایەكم نیە، گەر پارەم هەبوایە دەڕۆشتم، یان پارەم هەبوایە واو وام دەكرد.

هاوكات زۆرێك لەوانە ئێستا خاوەن پارەن ڕۆژگارێك خاوەنی هیچ نەبوون، بەڵكو ئامارە جیهانیەكان دوپاتی ئەوە دەكاتەوە، ئەوانەی سەروەتیان بە پشتاو پشت بۆ ماوەتەوەكەمترن لە٧٪ لەسەروەتمەندە جیهانیەكان، ٩٧٪ لەدەوڵەمەندەكان لەخاڵی سفرەوە دەستیان پێكردوەیان دەڵێن لەژێر سفرەوە.

سەرنجێكی ئەوانە بدە كەدەوڵەمەند بوون، ڕۆژێك لـ[illegible]ن خاوەنی هیچ نەبوون..بیل جیتز..جیس بنی..هیل سعید لەیەمەن.. سەرجەمیان لەخاڵی سفرەوە دەستبەكار بوون، هیچ كامێكیشیان لاوازبوونی دۆخی داراییان نەكردۆتە بەهانە، بەڵو لەكۆششی بەردەوامی ژیانیاندا بوون هەوڵیانداوە، بۆئەوەی ببنە خاوەنی سەروەت بونەتە خاوەنیشی.

## بیانوی ترس:

کەسێك كاری لەباڵوێزخانەی وڵاتەكەی خۆیدا دەكرد، پلەی بەرزبویەوەو بۆ سكرتێری یەكەمی باڵوێزخانەكە، ڕۆژێك لەكۆبونەوەیەكدا ڕای خۆی دەربڕی لەسەر كارێك، بەڵام بەتوندی بەرپەرچی درایەوەو هێرش كرایە سەری بەهۆی بۆچونەكەیەوە، دەرەنجامێكی ترسناك بەرۆكی گرت، لەئەنجامی ڕوبەڕوبونەوەی هێرشكەران تاكو كار گەشت بەوەی كەوڵاتەكەی خۆیشی ئاگاداریەكیان بۆ نارد، توشی ترسانێكی بەتین بوو تەنانەت لەبەرامبەر خەڵكیشدا نەیدەوێرا هیچ بڵێت، چیتر نەیدەوێرا توخنی بیرو بۆچونەكانی خۆی بكەوێت، كاریگەریەكی نیگەتیڤانەی لەسەری دروست كرد، من زیاتر لەجارێك چاووم بەو كەسە كەوتوە، چونكە زۆرجار لەكۆڕو سیمینارەكاندا ئامادە دەبوو، كاتێ لەبارەی چیرۆكەكەیەوە لێم پرسی بەمجۆرە هاتە ئاخاوتن‌و وتی: گەر لەئێستاوە بڕیار نەدەم‌و نەچمەوە سەر دۆخی جارانم، ڕای خۆم دەربڕم بۆخەڵكی بەبێ ترس ئەوا لەناو دەچم و دوچاری نەخۆشی جەستەیی‌و دەرونی دەبم.

ماوەی دوساڵ بەوجۆرە مایەوە، كاتێ دەخرایە بەردەم هەڵوێستێك كەدەبوو بڕیاری لەبارەوە بدات، بیری لەچارەسەر دەكردەوە، دۆخەكەلێرەدا گەلێك گران دەبوو، بەڵام تاڕادەیەك ئێمە لەگەڵیدا خەریك بوین، وێڕای ئەمەش لەگەڵ ترسەكەی ناخیدا بەردەوام بوو، وردە وردە خۆی لەو ترسە نەبان دەكرد، ڕوبەڕوی ئەو ئازارە بویەوە كەبەهۆی پیشەكەیەوە ترس بۆتە هاوڕێی هەمیشەیی، تاوایلێكرد دەستی لەو كارەی هەڵگرت، پرۆژەیەكی دیكەی كردەوە،

تیایدا سەرکەوتو بو، دوایش ئەوترسەی لێ دورکەوتەوەئەوەیکە ڕێگری لێدەکرد لەبەرامبەر پێشکەوتنو سەرکەوتندا.

## بیانوی نەریتەکان:

کاتێ هەوڵەکانت بۆکەسێکی جگەرە کێش دەخەیتە گەڕ تاکو هانیبدەیت واز لەجگەرە کێشان بکات، دەبینیت دەڵێت:

ئەمە یەکێکەلەوانەی خووم پێوەگرتوە، ناتوانم وازی لێبێنم، گەر وازی لێبێنم توشی تورەبونو هەڵچون دەبن، زۆرخۆری دەکەمو قەڵەودەبم، ئەمەو ئەوەم بەسەر دێت، ئەم خووخدانە هەمویان خۆی ڕاهێناوە لەسەری، بونەتە باو، بەڵام گەربێت‌و بریاری پاشەکشێ کردن بدات دەتوانێت گۆڕانکارییان بەسەردا بێنێت.

بەڵام هەموو شتەکانی خستۆتە ژێربیانوی خووەکانەوە دەڵێت: ئەمە خووە، پاشان ئەم خووە دەبێتە هۆکاری بەرگریکردنی لەپێشکەوتن، تێکچونی باری تەندروستی، توشبون بەشێرپەنجە زۆرێک لەنەخۆشیە کوشندەکان کەبەهۆی جگەرە کێشانەوە توشی دەبن.

## بیانوی تەمەن:

ئایا پێشتر کەسێك بیانوی ئەوەی بۆهێناویتەوە گوایە تەمەنی بچوکە، یان بەساڵاچووە لەتەمەنیدا؟

بیرمە جارێك چاوم بەکەسێك کەوت، تەمەنی ٦٨ ساڵ دەبوو، دەیویست نامەی دکتۆرا وەرگرێت، لێی پرسیم: ئایا لەتەمەنەدام بتوانم نامەی دکتۆرا لەفەرەنسا وەرگرم؟

پێم وت: ئایا ئەتوانیت بەفەرەنسی بەچاکی بدوێیت؟

وتی: بەڵێ.

وتم: ئەچــی ڕێگریــت لێئــەکات؟ پاشــان وتم دوای چــوار ســاڵی دیکەتەمــەنت ئەکاتە چەن؟

وتی: ٧٢ ساڵ .

وتم گەر دەسبەکاربیت تەمەنت دەگاتە چەن؟

وتی٧٢ ساڵ .

وتم: باجــارێکی دیکەپرســیارەکەت بــۆ دوبــارە بکەمــەوە، دوای چوارســاڵی دیکەتەمەنت دەگاتە چەن؟

وتی: ٧٢ ساڵ

وتم: گــەر نامــەی دکتــۆرا بــەماوەی ئەوچــوار ســالەوەرگریت دەبیتــە چــەن ساڵ؟

وتی: ٧٢ ساڵ .

چــەند جارێــك ئەمــەم بــۆ دوبــارە کــردەوە وتــی: مەبەســتت چــیە؟ ئایــا دەتەوێ دەسبەکاربم؟

وتم: گەر دەسبەکار نەبیت هەست بەچی دەکەیت؟

وتی: هەست بەنائومێدبون‌و دڵتەنگی‌و پەژارە دەکەم.

بۆیە پێشنیارم بۆکرد دەسبەکاربێت‌و بۆ دکتۆرا بخوێنێت.

دوای چــوار ســاڵ بەخۆشــیەك هاتــەوە بــۆلام‌و وتــی: کۆتــایم بەکارەکــەم هێناو نامەی دکتۆرام وەرگرت.

ســوپاس بــۆ خــوای گــەورە مــن تــوانیم تێگەشــتنی بگــۆڕم لەپەککــەوتنی تەمەنەکەیەوە بۆپێشکەوتن‌و گەشەکردن.

زۆرێــك لەخــەڵکی دەڵــێن: مــن تەمــەنم بــچوکە، یــان مــن بەســاڵدا چووم، چیتر توانای ئەوەم نیە.

بۆیە بیانوی ئەمەن ڕێگرە لەبەردەم پێشکەوتن‌و سەرکەوتندا.

## بیانوی دۆخی جەستەیی:

زۆرێــك بیــانو بۆدۆخــە جەســتەییەکەیان دێننــەوە دەڵێــت: مــن پــەکم کەوتوە، یان من درێژم، یان کورتەباڵام، یان کەئەندامم،...هتد.

لەگــەڵ ئەمانەشــدا زۆرێــك دەبیــنین کەمئەنــدامن‌و زۆریــش لێهــاتوون وەك( لــویس بریــل )داهێنــانی خوێنــدەوەی بەشــێوەی بریــل داهێنــا بــۆ نابینایــان، هەرچــەن خۆیــشی نابینــا بــوو، دەیتــوانی پەیامــەکانی بگەیەنێتــە خــەڵکی، کەچــی زۆرێکــی تــریش لەخــەڵکی دەبینیــن کەمئەندامێتیــەکی سادەی هەیــە کەچــی ئــەو کەمیــە بــەکاردێنێت بۆســۆزو بــەزەیی پێــدا هاتنــەوەی خــەڵکی، بڕوایــشی بــەخۆی هێنــاوە ئــەم کەمئەندامیە ساکارە ڕێگرە لەبەردەم جوڵەو پێشکەوتنیدا.

سەرنجێکی دکتــۆر (تــەها حسەین) هەرچــەن نابینــا بــو کەچــی پێگەیــشت، هــەروەها هــیلین کیلــر تــەنها هــەر نابینــا نــەبوو، نەدەیبیــست نــەدەیتوانی بــدوێت، کەچــی بەوپــەڕی لێهاتویــەوە تــوانی‌شــوێن پەنجــەی خــۆی بــۆ ئــەم چاخە دیاری بکات کەبەگرنگترین بیرمەندهەژمار دەکرێت تاکو ئێستا.

لەمــــەوە بۆماندەردەکــــەوێت بیانوەکــــانی پەککەوتــــەیی هــــیچ ڕێگرییەك ناکات لەبەردەم پێشکەوتن‌و سەرکەوتنی بەردەوامدا.

## بیانوی جەختی بەتین:

دەبینیــت کەســێك دەڵێــت: هــەموو خــەڵکی دڕنــدەن، ناکرێــت متمانــە بــەهیچ کەســێك بکــەیت، بۆیــە لــەناخی ئــەو کەســەدا ترســێکی گەورەدروســت دەبێــت لەمامەڵــەکردن لەگــەڵ خــەڵکی، بۆیــە دەترســێت لــەبزاڤو پێــشکەوتن، کــار لەخــەڵکی دەکــات‌و کاریــشی لێــدەکرێت، گــەر پێــی

بوترێـت: وەرە بالەپرۆژەیەکـدا دەسـبەکاربین، دەبینیـت پێـت دەڵێـت: دەسـت لـەکاری وامـەدە، مـامم ئـاوای بەسـەرهات، یـان خـاڵم هـەروای لێ بەسـەر هـات، دەیـەوێت و هەوڵئـەدات کاریگـەری لەسـەرت هـەبێت کاریگەریـەکی سـلبی، سـووربوون و ترسـی بـەتینی زۆر بەسـلبی کـاری تێکـردوون، وایلێـدەکات نیگەرانـە لـەدۆخی هاوسـەرداری، لەگـەڵ مناڵەکانیـدا هـەمانجۆرە، تەنانـەت لـەژیانی کەسـێتی خـۆیی و کۆمەڵایەتیـشدا، هـەرگیز بـەرەو پـێش ناچـێت، هـەموو پێـشنیارێك بـەرەو سـەرکەوتنی ببـات ڕەتـی ئەکاتـەوە، هەرکەسـێك بناسـێت پێـی دەڵێـت: وریابـە، ئـەوە قورسـە، ئـەوە کاریگـەری لەسـەرت دروسـت ئـەکات، ئـەم جـەخت کردنـە دەبێتـە ئاسـتەنگێکی ئـاوەز بـۆیی و، ڕێگـری لێـدەکات لەپێـشکەوتن و سـەرکەوتن نایـەڵێت توانـا لـەبن نـەهاتوەکانی بخاتـە گـەڕ لەهەرکارێك لەبەرژەوەندی ئەودا بێت.

### کەواتە بائێستا بپرسین:

**ئایا ئەم هەموو بڕوبیانو ئاستەنگە ئەقڵیانە کاردەکەنە سەر مرۆڤ؟**

**بێگومان کاریگەری تەواویان هەیە.**

**کاتـێ مـرۆڤ ئامـادەیی خـۆی دەردەبڕێـت کـەبڕو بیانوەکـان بۆخـۆی داتاشـێت، جابیانوەکـان جەسـتەیی بێـت یـان بیـانوی دەرامـەت بێـت یـان کۆمەڵایـەتی یـان ڕۆحـانی، ئایـا لـەو باوەڕەدایـت دوای ئەمانـە سـەرکەوتن بێتە یاوەری؟**

لێـرەدا خولێـك هەیـە ناومنـاوە( خـول دەرونـی بـۆ نەخۆشـیەکانی بیـانو) ئـەم خولەبێئـەوەی کەسەکەهەسـت بـەخۆی بکـات ئـەو دەسـت پێـدەکات، بڕیـار ئـەدات بیانویـەکی دیـاریکراو داتاشـێت بۆخـۆی بۆئـەوەی بـەرگری

لێبکات لەبەرەو پێش چوون، بۆ ئەوەی گاڵتەی پێنەکرێتو نەبێتە گاڵتەجاڕی خەڵکی، خۆی دەکاتە یان پەککەوتەیەک، یان نەخۆشێک، یان هەرشێک شایانی پەکخستنی بێت، هەروەک ئەو پیاوەی دەیویست نامەی دکتۆرا وەرگرێت، نەیدەتوانی دەسبەکاربێت بەهەر هۆیەک بێت، بۆیە درۆیەک بۆ خەڵکی دێنێتەوە دەڵێت: پارەی تەواوی لەبەردەستدا نیە تاکو نامەیەکی دکتۆرا بێنێت، یاخود نەخۆشە، یان لەزانکۆ بەبێتاوان دەریانکردوەو ستەمیان لێکردوە، چونکە توانای بزاوتنی نییە، لەجیاتی ئەوەی بجولێتو پێش بکەوێت دەستدەکات بە دۆزینەوەی بروبیانوی جۆراوجۆر ڕێگرن لەبەردەم پێشکەوتنو سەرکەوتنەکانیدا.

لەقۆناغی یەکەمیدا بڕیارەکەی داوە، دوای ئەوە بیانویەکی دۆزیوەتەوە، قۆناغی سێیەمیش دەیخاتە مەیدانی کارپێکردنەوە.

ئیتر لەبەرئەوەی بیانویەکی دۆزیوەتەوە کاری پێدەکات، هەرکاتێک کاری پێدەکات هەموو جارێکیش لەدڵیدا گەورە دەبێتو لەگەڵ گەورە بونیدا زیاتر کاری پێدەکات، چونکە بەبەردەوامی دوبارەی دەکاتەوە ئیتر ئەبێت بەخوویەک تیایدا ئالودەی دەبێتو دەیکاتە بڕیار ..بۆهەڵبژاردن، بۆ کارپێکردن، بۆ دوپاتکردنەوە ئیدی دەبێتە خوو، هەرشتێ کارپێبکەین بۆیەکەمجار مێشک تۆماری دەکات لای خۆی، لەگەڵ هەموو دوبارە کردنەوەیەکیدا ئەویش جوانتر تۆماری دەکات.

بۆیە کاتێک مرۆڤ بڕیارێک ئەدات، بیانویەک ئەدۆزێتەوەو کاری پێدەکاتو دوبارەی ئەکاتەوە ئەوکاتە دەبێتە نەریتێک، لەگەڵ ئەم نەریتەدا گەورە

دەبێــت، هــەرکاتی بیــەوێت لەونەریتــە دورەپــەرێز بێــت ناتوانێــت، چــونکە بــڕوای بــەخۆی کــردوە بــەکاری بیــات، لــەبڕیارەوە بۆهەڵبــژاردن، پاشــان بۆبــەکاربردن،...پاشــان دوپاتکردنــەوە..بــۆ هــەموارکردن ئــەنجا بــۆ باوەڕپێکردن.

لەبیرمــە هــاوپۆلێکم هــەبوو لەپــەیمانگای مۆتێلــەکان، هەمیــشە بەخــەڵکی دەوت: ئــەو لەکاراتیــدا پــشتێنی ڕەشــی وەرگرتــوە، بەهــەموو بڕوایــەکی تەواویــەوە هــەرگیز یــاری کــاراتی نــەکردوە لەژیانیــدا، بــەڵام دەیوست ئەو بڕوایە بۆخەڵکی بچەسپێنێت کەلەکاراتیدا پاڵەوانە.
ئــەوجا هــەرکات لەوبارەیــەوە دەدوا بــڕوای بــەخۆی هێنــابوو کەپاڵەوانــە لەکاراتیــدا، پاشــان دەســتیکرد بەلاســایی کردنــەوەی بروســلی، هەنــدێك جوڵــەی کــاراتی لەبــەردەم خەڵکــدا ئــەنجام ئــەدا، کەچــی ســەرەنجامەکەی بەراســت گــەڕا، بــەڵام ترســێکی زۆری لەخــەڵکی هــەبووتا ئاســتێك دەیــوت: من نامەوێت ئازاری هیچ کەسێك بدەم!
ڕۆژێکیــان چــومە نێــو پــەیمانگاوە بــەڵام، لــەکاتی ئاســایی خــۆم دواکــەوتبوم، ئۆتــۆمبێلێکی جــۆری(ســبور) م لێــدەخوڕی، هەرکەچــومە ژورەوە کۆمــەڵێك لاووم بینــی لەهاوڕێکــەمیان ئــەدا، هــیچ ڕێگەیــەکی دەربــازکردنیم نــەدەزانی جگــە لــەوەی بەئۆتۆمبێلەکــەم شــاڵاووم بــۆ بــردن، بــەقایمی ئــستۆپێکم کــرد، هــەمویان ڕایــانکرد دوای ئــەوەی زۆریــان لێــدا بــوو، ئامۆژگارییــەکی زۆرم کــرد واز لــەو درۆیانــەی بینێــت یــان بەڕاســتی لەکاراتیدا دەسبەکاربێت.
تــۆ هەرشــتێك بــسپێریتە مێــشکت ئــەویش بەڕاســت وەریــدەگرێت، دوای ئەوە دەیکاتــە بابــەتو بەشێك لــەتۆ، گــەر مرۆڤ بیانویــەك بۆخــۆی داتاشێت

بـڕوای پێـدێنێت، بۆنمونـه گـەر بـڕوا بـەخۆی بێنێـت نەخۆشـە بـەخۆی دەڵێـت هـەر دەبێـت سـەردانی پزیـشك بكـەم، مـن نەخۆشـم نـاتوانم بجـوڵێم یـان كارێـك ئـەنجام بـدەم، كـەبڕوای بەمحاڵـەی خـۆی هێنـا دەیكاتـە پیـشەی ڕۆژانـەی خـۆیو دەیـەوێت چارەسـەری شـتێك لەخۆیـدا بكـات كـەبونێكی ڕاستەقینەی نییە.

بەڵگـەش بـۆ ئـەم ئامـارە یـەكێك لـەزانكۆكان پێـی هەسـتاوون سـەلماندویانە لـەنێوان هـەر دەكـسێكدا نـۆ كەسـیان دەچـن سـەردانی پزیـشك دەكـەن بۆنەخۆشـیەكی سـاختە تـەنها بـۆ دڵنیاكردنـەوەی خۆیـان، یان لەگومانی ئەوەدان گوایە نەخۆش بن كەچی نەخۆشیش نین.

ئەوكەسـەی دەڵێـت: نەخۆشـیەكی دەرونـی هەیـە هیـچی لەدەسـت نایـەت بیكـات تـەنها ئاسـتەنگی نەخۆشـی نـەبێت بۆخـۆی دابنێـت... بیـانوی دۆخـی دەرونـی.. لـەم حاڵەتەشـدا دەگاتـە ئـەوەی قۆنـاغی خـولی دەرونـی بـۆ نەخۆشـی بڕوبیـانو، دوای نەخۆشـی بڕوبیـانو، دوای ئـەو قۆناغـەش خـۆی دەگەیەنێتـە قۆنـاغی هاوكـاری، ئـەنجا دەسـتدەكاتە هاوكـاری كردنـی خـۆی، تـاكو كەسـێكی لێهەڵدەكـەوێتو پێـی دەڵێـت: تۆكـاتی خـۆت بـەفیڕۆ ئـەدەیت، ..یـان تـۆ درۆزنیـت، ئـەویش پێـی دەڵێـت: تـۆ ئاگـات لەچـیە؟ نازانیت من چیمە، من نەخۆشم، ئەمەو ئەوەمە.

مـادام بیـانو بۆخـۆی دێنێتـەوە دیـارە بەرگریـشی لێـدەكات، مـادام بـڕوا بـەخۆی دێنێـت بەكاریـشی دەبـات، هـەمواری دەكـات دوبـارەی دەكاتـەوە هاوكـاری ئـەوبیانوەش دەكـات، دەگاتـە دوایـن قۆنـاغ، لەخولەدەرونیـەكان، ئـەویش خـوو پێـوەگرتن، مـادام هاوكـاری ئـەو بیـانوە دەكـات ئـەوا تیایـدا ڕەنـگ ئەداتـەوە، بۆیـە دەسـت بـۆ هـەركارێك ببـات

بیانوەکانی بۆ خەڵکی باس دەکات دوای ئەمانە ئایا پێت وایە کەسێکی بەمجۆرە پێش دەکەوێت؟! گەشە دەکات؟! سەردەکەوێت؟! ئامانجەکانی بەدی دێنێت؟! هەرگیز.

ئەوە تواناکانی پتر نابن هێزەکانیشی تەنها لەبرەودانی بیانوەکانیدایە، بۆیە تواناکانی بەکاردەبات لەدژی خۆی بێئەوەی هەست بە خەمۆکی بکات، بۆیە لەکۆنەوە وتراوە: خۆتان نەخۆش مەخەن، نەخۆش دەکەوون، دەمرن.

تۆ خۆت نەخۆش دەخەیت، خەڵکی دێن بۆلات سەردانت ئەکەن، بەزەییان پێتدا دێتەوە، ووتەی بەزەییو شەفەقەت لەخەڵکی دەبیستیت سەبارەت بەخۆت، پاشان دوای ڕۆشتنی خەڵکی ئایا دڵت بەم قسانەیان خۆشە؟

ئێستا چی بەخۆت دەڵێیت؟ چاوەڕوانی بەیانی دەکەیت دیسان بێنەوە بۆلاتو هەمان قسەت بۆدوبارە بکەنەوە؟ دوای ئەوە لەوبڕوایەدایت بەڕاستی نەخۆش بیت، گوایە ئاوەزی مرۆیی هاوکاریت بکات کەبەڕاستی نەخۆش بیت.

ئەمەش خولی نەخۆشی بیانوەکانە، بڕیاردان، هەڵبژاردن، پاشان بەکاربردن، پاشان هەموارکردن، پاشان دوبارە کردنەوە، پاشان بڕوا بەخۆهێنان، پاشان هاوکاریکردن، پاشان خوو پێوە گرتن.

بیانووەکەدەبێتە ئاستەنگێکی تەواو بەهەموو هێزە ژیانت ئەوەستێنێت لەپێشکەوتنو گەشەکردن، وابزانە دەچیت بۆ سورابوونی شەمەندەفەر، پاشان لەڕێگە دوادەکەویت لەوادەی دیاریکراوی دەرچوونی شەمەندەفەرەکە، ئایا شەمەندەفەرەکەچاوەڕوانی تۆ دەکات؟!

بێگومـــان ..تـــا شەمەندەفەرەکەپێـــشکەوتنو گەشـــەکردنە گـــەر دوا بکـــەویت ناتوانیـــت پـــێش بکـــەویت، زەمـــەن دەڕواتو چـــاوەڕوانی تـــۆ ناکـــات، گۆڕانکـــاریش بەڕاســـتی ڕودەدات جـــا تـــۆ بتـــەوێ یـــان نەتـــەوێ، گـــەر تـــۆش نـــەگۆڕێیت، ئـــەوا گۆڕانکـــاری هـــەر ڕودەدات، زەمـــەن دەڕوات، تـــۆ بجوڵێیـــت یـــان نـــەجوڵێیت، ئەوشـــەمەندەفەرەی ڕێـــدەکات ئـــەوە تەمـــەنی تۆیـــە دەڕواتو گەڕانـــەوەی نیـــە جـــارێکیتر، ئێـــستا کـــاتی ئەوەیـــە دەســـبەرداری نەخۆشـــیەکانی بیـــانو بیـــتو بـــەکاریان نەبـــەیت، چـــونکە نەخۆشـــی بیـــانو قۆناغێکی دیکەبەدوای خۆیدا کێشدەکات ئەویش خولی ئازارەکانە.

ئـــەو داتـــا کۆنـــەی خۆتـــت لەســـەر ڕاهێنـــاوەو لـــەدنیای دەرەکیـــەوە وەرتگرتـــوە بـــڕوات پـــێ هێنـــاوە، نەخۆشـــیەکانی بیـــانوی پێبـــەکار دەبـــەیت ئەوانـــە لەداتاکۆنەکـــەوە سەرچـــاوەیان گرتـــوە...بۆدوپاتکردنـــەوە..بـــۆ ناوچەی ئارامیو ئاسودەیی.

**نمونەیەکی زۆر سادەت بۆ دێنمەوە:**

بۆقێکیـــان خـــستە نـــاو قاپێـــك ئـــاوی گەرمـــەوە، هەرکەخـــستیانە نێـــو ئاوەکـــەوە، یەکـــسەر بـــازێکی بـــۆ دەرەوەدا، چـــونکە هەســـتی بـــەگۆڕینێکی لـــەناکاو کـــرد، کـــەمێك ئـــاوی گـــەرمیان هێنـــا هـــەمان بۆقیـــان تێکـــردەوە، ســـەرقاپە شوشـــەکەیان لێداخـــست، ئـــەمجارەیان هـــەوڵی بـــازدانی دایـــەوە، بـــەڵام توانـــای دەربـــاز بـــوونی نـــەبوو، چـــونکە قاپەکەبەبتـــەوی داخـــرا بـــوو، چـــەنجارێکی دیکەهـــەوڵی دایـــەوە بـــەڵام پوچـــەڵ بـــوو، لەئاوەکـــەدا مایـــەوە، ئاوەکـــەیان بـــۆ زیـــادکرد، پاشـــان ئاوەکـــەیان خـــستە ســـەر ئـــاگرێکی هێـــواش، پلـــەی گـــەرمی ئاوەکەبـــەرز بویـــەوە، بۆقەکەلەگـــەڵ پلـــەی گەرمیەکـــەدا

ئـالودە بـوو، پلـەی گەرمیەکـەی زیـاتر بـوو، جـارێکیتریش لەگـەڵ ئـەو پلـەی گەرمیە ڕاهات، تاکو بۆقەکیان بەپێست داماڵراوی دەرهێنا.
ئەمـەش نمونـەی زۆرێـك لەخەڵکیـە، هەرهێنـدەی بخرێنـە جێگەیـەکی دیاریکراو یەکسەر خـووی پێـوە دەگـرن، خـوو بەبیانویەکـەوە دەگـرن، ئـەو بەرنامەڕێژیـەی پێـشو دوبـارە دەکەنـەوە، خۆیـشیو خـەڵکیش بـڕوا پێـدێنێت، تادەگاتـە ناوچـەی ئـارامی، تـاکو دەبیینیـت وەکـو بۆقەکـەی لێهـاتوە، ئـیتر لێـروە خووەکـان ڕودەدەن، ئازارەکـان پێکـدێن، ئەمانـە ئـازاری خـودین، بـەهۆی ئاسـتەنگە ئاوەزیەکانـەوە، هـەروەك برێکـی ئۆتۆمبێـل کـەرێگری دەکـات لەڕۆشـتنی بـەرەو پـێش، لەگـەڵ ئـازاردا پنتێکـی گـرنگ دێتـە کایـە، لەزانـستی "دینـامیکی گونجانـدنی دەمـاردا" باسـم کـردوە، سـوپاس بـۆ پـەروەدگار ئـەو زانـستە لەلایـەن خۆمـەوە دامـەزرێنراوە، ئەوخاڵـەم بـە( سـاتی ژیـان) ئـەویش مـرۆڤ کاتـێ لـەدایك دەبێـت پاكوبێگـەردە، پاشـان دەسـتدەکات بـەململانێی ئاسـتەنگەکانی ژیـان، وەك نەخۆشـکەوتن، یـان ترسـی کەوتنـە سـەرزەوی، یـان هەسـتی تـەنیایی، هەمیـشە دەیـەوێ دایکـی لـەلاییێت، ئاسـتەنگی دوایـەك، هـەتاکو گـەورەبێت ئاسـتەنگەکان بـەگوێرەی ئـەو دەگـۆڕێنو بەبـەردەوامی لەگـەڵ سـاتەکانی ژیانیـدان، دوای ئـەوە خـاڵی گـۆڕان ڕوئـەدات ئـەویش کاتێکـەمرۆڤ دەگاتـە قۆنـاغی پـەیبردن، دەرکـی تـەواو دەکـات بـەقۆناغێکی قورسـدا دەڕوات ئـەنجا ئاسـتەنگە ئەقڵیـەکانی دەخاتـە گـەڕ، دەرك بـەوەدەکات دەبێـت نەخۆشـی بیانوەکـانی بـەکاربیات، وەك نەخۆشـی دەرونـی، یـان نەخۆشـی دۆخـی دارایـی، یـان کۆمەڵایـەتی، وەك پێـشتر ئامـاژەمـان پێکـرد، هەرکـەمرۆڤ پـەی بـەوە بـرد شـتێکی نائاسـایی هەیـە

دەبێت بیگۆڕێت چیتر ئازارەکانی دەگۆڕێت بۆهێزو تواناکان، وەك ئەوەی کەسێك دەڵێت: من لەمڕۆ بەدواوە ناتوانم بەوجۆرە بژیم، هەردەبێت بیگۆڕم، بۆیە بڕیار ئەدات بەرەو باشتر بچێت، گەرکەسێك هەبێت بتوانێت هەرشتێك بکات، ئەی من بۆنەتوانم بیکەم، بەمجۆرە بەدەم ئازارەوە ئەتلێتەوە، ئەم ئازارەش لەناخیدا ئەتەقێتەوەو دەردەچێت، وەك ئەوەی برێکی ئۆتۆمبێلەکەراکێشیت‌و ئەنجا پێ بنێیت بەپێ گازدا بەتوندی، ئەنجا لەپڕ دایبدەیتەوە دەبینیت ئۆتۆمبێلەکەباز ئەدات بەرەو پێش وئەداتەوە بەزەویدا وەك پێی دەڵێن(دەرچوونی ئەمریکیانە) ئیدی ئەوکەسە دەبێت ژیان مافی خۆیەتی، دەیەوێ بەختەوەر بێت، دەستدەکات بەگەڕان، بلیمەتەکان دەبینێت سنورێك نیە بۆ بلیمەتییان، یان زاناکان، یان سەرجەم سەرکەوتوەکان، ئەوانیش هەموو کۆسپە ئاستەنگێکیان هەبوە بۆدەستبەردار بوون لەئامانجەکانیان، بەڵام بڕیاری بوێرانەیان داوە کەهێزو تواناکانیان بخەنەگەڕ بۆبەدیهێنانی ئامانجەکانیان.

کەسێك بەناوی(لی ئایاکوکا) ئەم کەسەی لای(هنری فۆرد) کاریدەکرد، پاشان ڕۆژێ لەساڵی ١٩٦٢ ناکۆکیەك کەوتە نێوانیان‌و (هنری فۆرد) ئەم کەسەی لەکارەکەی دەرکرد، کابرا لەدڵی خۆیدا سوێندی خوارد کەدەبێت ڕۆژێك لەڕۆژان بێتە خاوەنی کۆمپانیایەك گەورەترو بەهێزتربێت لەکۆمپانیاکەی فۆرد، تەنانەت فۆرد لەچاو خۆیدا بێتە گرگنێکی چکۆلانە.

دوای ئەوە کۆمپانیای (کرایزلر) پێشنیاری بۆکرد لای ئەوان کار بکات، ئەمیش دەبو پەسەندی بکات چونکە شانەکانی لەژێرباری قەرزدا

چەمیبوون دەگەشتنە ٤٠ ملیۆن دۆلار، هاوکات هەموو سەروەتی لە٦٥٠ ملیۆن تێپەڕی نەدەکرد، خاوەنی ٢٢ لقی کۆمپانیا بوون لەجیهاندا، ٦٥٠٠٠کرێکارو کارمەند دەبوو بکەوتنایەتە سەرشەقامەکان، (لی ئایاکوکا) بیریکردەوە، چۆن بەشێوازێکی دروست مامەڵەبکات، بیرکردنەوەکانی هانیاندا کەسانی پسپۆڕ بێنێتە ئەم کایەیەوە بۆیە ونبوەکەی خۆی لەکەسێکدا بینیەوە ناوی(مایل لی) بوو ئەم پیاو پسپۆڕبوو لەمامەڵەکردنی ئەمجۆرە کارەساتانەدا.

یەکەمین کارێك (مایکل لی) دەسبەکاربوو تێیدا ڕاگرتن‌و داخستنی بەشە ماندوو لەکارکەوتوەکان بوو گرنگیدا بەبەشە کاراکان بەشێوازێکی دروست.

دەبو جارێکی دیکەڕێگە چارەیەکیتر بدۆزێتەوە بۆوەدەست هێنانی سەرمایەیەك، چونکە هیچ کامێك لەبانکەکان قەرزیان پێنەدەدا بەهۆی دۆخی خراپی داراییەوە، لێرەدا(لی کوکا) بەجۆرێکی دیکەبیری کردەوە، بۆیە ڕاستەخۆ پەنای بردە کۆنگریسی ئەمریکی بۆوەرگرتنی قەرز، ئەوکاتە رۆناڵد ریگان سەرۆکی ئەمریکا بوو، وتی یان ئەوەتا دەبێت ٦٥٠٠٠کەس بکەونە سەرشەقامەکان‌و نێوە موچەیان بدەنێ یان ئەوەتا ٥ملیۆن دۆلارم بەقەرز بدەنێ، حکومەت هیچ پەنایەکی نەما بۆیە قەرزەکەیان پێدا، ئەمیش هەستا بەجێبەجێ کردنی نەخشەکەی بەشێوازێکی دروست، لەسەرەتاوە ئەو بەشانەی داخست کەهیچ گرنگیان نەبوو، بینی سەرۆکی ئەنجومەنی بەڕێوەبردن ١٢هەزار یاریدەدەری هەیە هیچیان کارێکی ئەوتۆیان نیە دەستی کردە کەمکردنەوەیان، ئەنجا کەوتە نەخشەکێشانی کاروبارە ناوخۆ، بیریان

لــەداهێنانی شــتێکی نــوێ کــردەوە، بۆئــەوەی کڕیــار بــەلای خۆیانــدا کێــشبکەن هەســتان بەدروســتکردنی یەکــەمین ئۆتــۆمبێلی قــسەکەر ناویــان لێنـــا(E-CLASS ئـــەم ئۆتۆمبێلەلەســـەر ١٢جـــۆر قـــسەی دەکـــرد: بۆنمونــە دەیــوت بــەنزینت پێنــەماوە، یــان وریابــە دەرگایــەك کراوەتــەوە، سەرەنجامەکەشــی خــەڵکی بەپەرۆشــەوە پێــشوازیان لێکــرد نزیکــەی ١٤ ملیــۆنی لێفرۆشــرا لەماوەی ســێ مانگــدا، لــەماوەی کــەمتریش لــە٥ســاڵدا قەرزەکانی دایەوە.

پاشــان لەلایــەن (ســی ئــێن ئــێن)ەوە بــانگهێش کــراو لێیــان پرســی چــۆن توانیت ئەمانە بکەییت؟

وتــی: وتــی یەکــەمین شــت دەرککــردن، پــەیبردنێکی تــەوام هــەبوو بەهــەبونی شـــتێکی ناسروشـــتی ئـــەوەش وایلێکـــردم نەخـــشەکەم بکێـــشم و هەڵــسەنگاندنی بۆبکــەم پاشــان هــەمواری بکــەم، هەســتام بەدامەزرانــدنی کەسانێکی شایــستەو گونجــاو بۆئــەوەی هاوکــاریم بکــەن لەجێبــەجێ کردنــی نەخــشەکەمدا، ئــەنجا داهێنـــان، ئـــەنجا کـــاری ســـتراتیژی، ئـــەزمون‌و دەســبەکاربوون، هەڵــسەنگاندن، هــەموارکردن، ئــەنجا بــەردەوامی لەبەشــە ناوخۆییــەکان، بەشــە دەرەکیــەکان پاشــان خزمــەتگوزاری بــۆ کڕیارەکــان، چـــۆنیەتی بەدەســـتهێنانی متمانـــەی کڕیارەکـــان بەوەیکەهـــەردەم نوێگەرییان پێشکەش دەکرێت.

بەمڕێگەیــە بویــە بــەهێزترین‌و گــەورەترین کۆمپانیــا لــەریزی ٥ کۆمپانیــا بەناوبانگەکــەی جیهــان، ئــیتر ئــەم کەســە لــەوێ نــەما، کەســێکی هاتــە شــوێنەکەی بــۆ بــەڕێوەبردنی کۆمپانیــا، ئاســتی لەپلــە٥ هاتــە پلــەی٣٦

لەسەر ئاستی جیهانی هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆتەنگەوە نەبونی بەردەوامی و نوێکاری.

حەزی ئاگرین هەمیشە لەچاوانی کەسی سەرکەوتودا ئەدرەوشێتەوە، هەموشمان ئەتوانین بینە خاوەنی ئەو سەرکەوتنە گەر بتوانین هۆکارەکانی جێبەجێ بکەین...

باسەرنجێك بدەین لەچیرۆکی (محمد علی کلای)

لاوێکی چکۆلانە لەولاتێکدا دەژیا پڕبوو لەڕەگەزپەرستی، خەونی بەوە دەبینی بێتە پالەوانی جیهان لەملاکەمەدا، هاوکات هەموو خەلکی گالتەیان پێدەکرد، بەلام ئەم هەولی خۆی ئەداو پشتی سارد نەدەبویەوە، سەرنجی جولەی یاریزانەکانی ئەدا، جولەی قاچەکانیان، دەستیان، چاوەکانیان، هەناسەکانیان، زیاتر لەجارێکیش دۆڕاندی، بەلام دوای ئەوە توانی سبەرکەوێت، تاکار گەشتە ئەوەی ڕکابەری لەگەلا ( جۆرج فۆرمان)دا بکات. ئەو کەسەی هەموان لێی دەترسان، لێدانو زەبری ئەوپیاوە بەهێزتر بوو لەلێدانی ئەسپ، محمد علی کلای زۆر دەترسا لەبەردەم ئەم پیاوەدا یاری بکات لەگەل ئەمەشدا بەگژیدا چویەوەو یاری لەگەلدا کرد، بەلام دۆڕاندی، جۆرج فۆرمان توانی ١٢ زەبری پێ بگەیەنێت بەدەمو چاوی و بالێکی بشکێنێت بردیانە نەخۆشخانەو خالێکی زۆر ناهەمواری هەبوو، خەلکی پێیان دەوت جارێکیتر توخنی ئەو جۆرە یارییە نەکەوێت، بەلام بۆجارێکیتر هەستایەوە دوبارە دەستیپێکردەوە نەك تەنها هەر ئەمەبەلکو بڕیاریدا لەبەرامبەر جورج فۆرماندا جارێکیتریش بۆستێتەوە ئەمجارە دەستیکردە سەیرکردنی ئەو فیلمە تۆمارکراوانەی لەگەل جۆرج

فۆرماندا یاریدەکرد بۆئەوەی لێوەی فێر بێت، تاکو بەتەواوی چویە ناخیەوە، دوای ئەوەی لەنەخۆشخانە دەرچوو دەستیکردە مەشقکردنێکی چڕو پڕ شەوو ڕۆژ خەریك بوو، بۆیە جارێکیتر ململانێی لەگەڵ جورجدا کردەوە دوابینەوەی جۆرج هەواڵەکەی پێگەشت بەخەڵکی وت: بەڕاستی دەبێت تامەزرۆی بینینەوەی ئەو پیاوەبن چونکە پێدەچێت ئەمە دواین بینینەوەی بێت، ماڵاوایی تەواوی لەگەڵ بکەن چونکە من بەتەواوی ڕزگارتان ئەکەم.

ئەم پاڵەوانێتیە لەئەفریقا بەڕێوەچوو، بەمانگێك پێش سازکردنی پاڵەوانێتیەکەمحمد علی کلای خۆی بەخەڵکی ناساندو خەڵکیش خۆشەویستیەکی زۆریان بۆدەربڕی، دەهاتە نێوشەقامەکانو تێکەڵی خەڵکی دەبوو، خەڵکەکەش بەناوی ئەوەوە هیتافیان بۆ دەکێشاو هانیان ئەدا، هاواریاندەکرد محمد براوەیە، محمد پێشەوایە دوای ماوەیەکی کەم جۆج فۆرمان دابەزی لەگەڵ سەگێکی پۆلیسی دڕندەدا لەگەڵ ئەوەی هیچ کەسێك خۆشەویستی بۆ دەرنەدەبڕیو لێیدور دەکەوتنەوە.

جۆرج فۆرمان وتبوی یەکەم کارێك بیکەم ئەمەیە هەڵدەکوتمە سەر قەپۆزی محمد علی کلایو تێکی دەشکێنم، زمانی ئەبڕم، بۆئەوەی جارێکیتر نەوێرێت قسە بێت بەزاریدا، سێ ڕۆژ بەرلەدەستپێکردنی یاریەکەفۆرمان بریندار بوو، یاریەکەدواخرا بۆ سێ هەفتەی دیکە، کلای لەڕوی دەرونیەوە داڕما، بەڵام سەرلەنوێ دەستی کردەوە بەڕاهێنانەکانی و شانی دایە بەر دۆخەکەوەکخۆی، پاشان کاتێ یاریەکەدەستی پێکرد، ویستی ئەوەبڕوایە بۆ فۆرمان دروست بکات

هەرچەندە لێدانەکانی بەزەبر بن ئەوا کار لەم ناکەن، هاوکات هەر یاریزانێک دەترسا لەلێدانەکانی فۆرمان، هیچ بۆکس وەشێنێک نەیدەتوانی دو یان سێ خول زیاتر خۆی لەبەردەم لێدانەکانی فۆرماندا بگرێت، بەڵام کلای توانی ١٢جار خۆییگرێت لەکۆتاییشدا بۆسێکی یەکلایی کەرەوەی تێسرەواند، بەهۆی ئەو بۆکسەوە توانی بەسەریدا سەرکەوێت، پاشان موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاندو بەخەڵکی وت بەکۆمەکی خوای تاکو تەنیا هەوڵو کۆششی خۆم تەقالاو سوربوونم توانیم ئامانجەکەبەدی بێنم.

ئەمەش نمونەیەکی تری هەوڵو تێکۆشانە بۆ سەرکەوتن پیاوێک لەسوریا بەناوی( سعید معصرانی) لەمناڵییەوە توشی ئیفلیجی بوبو، بەهەموو جیهاندا دەگەڕاو توانی سەردانی ٢٨ وڵات بکاتو هاوکاری منالانی توش بوو بەئیفلیجی بکات لەپیاوێکی ئیفلیجی سادەوە گۆڕا بۆ پیاوێک هەڵگری پەیامێک بۆ ئەو نەخۆشانە، بۆ ئەوەی سەر لەنوێ دەروازیەکیان بۆ والاکات دەیوت: نا بۆئیفلیجی، نا بۆ پەککەوتویی، نا بۆشێرپەنجە، ئەمە دروشمەکانی ئەو پیاوە بوو، خەڵکی لەدوایەوە دەڕۆشتن و گومانیان لەوتەکانی دەکرد کەدەیوت: نا بۆ ئیفلیجی، نا بۆ کەمئەندامی، نا بۆ شێرپەنجە، ئەمەش نمونەیەکی دیکەی هێزە، هەرکەسێکی تر بوایە لەجیاتی ئەو دادەنیشتو جوڵەیەکی بۆنەدەکردو هیچی لێ نەدەوەشایەوەو دەیوت: من دوچاری نەخۆشی ئیفلیجی بووم ناتوانم هیچ کارێک بکەم، بەڵام ئەم پیاوە کۆڵی نەئەداو دەبزواو تەپوتۆزو غوباری لەخۆی ئەتەکاند.

منو تۆش پێویستە وابکەین، بەڵام گەر هەوڵی بۆ بدەین...

منداڵێــك لــەدایك بــوو نــاوی( رون ســكالین) خــەونی ئــەم منداڵەئەمــەبو دەیویــست بێتــە یــەكێك لەپاڵەوانــەكانی كــاراتی لەجیهانــدا، بــەڵام هــەردو قاچــەكانی قرتــا بــوون، بــاوكی خۆشەویــستیەكی زۆری بــۆی هــەبوو، بــردی بۆیــەكێك لەیانــە وەرزشــیەكانی هونــەری كــاراتی، لەیانەكــەدا پیاوێــك هــەبوو نــاوی(لیــزلی) یــەكێك بــو لەپاڵەوانــەكانی یــاری كــاراتی، ئــەم كــوڕەی وەك وەرزشــوانێك پــەروەردە كــرد، فێریكــرد چــون كورســیەكەی بــەكاربێنێت لــەكاتی ڕویەڕوبونــەوەدا، بەڕاســتی دەســبەكاربوو تــاكو پــشتێنی ڕەشــی بەدەســت هێنــا لــەماوەی كــەمتر لەچوارســاڵدا لــەوەش ســەیرتر ئــەوەبو لەئــەمریكای باشــور پاشــان لەئــەمریكای بــاكور، پاشــان پاڵــەوانێتی جیهــانی، ئێــستا خــاوەنی١٢ جۆدۆیــە، وشــەی جــۆدو واتــە یــەكێك لــەو یانانــەی فێربــونی هونــەری كــاراتی تێــدا ئــەنجام ئــەدرێت، ١٢هــەزار یــاریزان لەژێردەستی ئەودان.

ئــەوەی وتمــان نمونــەی ئــەو پیــاوە بــوو كــەخۆڵو تــۆزی ناتوانــایی لــەخۆیان ئەتــەكێنن، تواناكانیــان بــەئاگا دێــنن، مــنو تــۆیش ئــەتوانین وابــین بەمەرجێك هەوڵی بۆ بدەین.

تاكــەی زەقــەی چــاوومان بێــتو جوڵەیــەكی بــۆ نەكــەین، خەونــەكان لەبەردەممانــدان، كەســێك خــاوەنی ئۆتۆمبێلێكــە، كەســێكیتر خــاوەنی كۆشــكێك، كەســێكیتر كــارێكی چــاكی هەیــە، منــیش ئــەتوانم هــەمانجۆربم بــەڵام بــەو مەرجــەی هــەوڵی بــۆ بخەمەگــەڕ، تــەنها جیاوازیــەك لەونێوەنــدەدا جوڵەیــە، كەســانێك لەبزاڤــدانو كەســانێكی دیكــەهیچ بزاڤێكیــان نییــە، كەســێك دەوڵەمەنــدەو خــاوەنی كۆشــكو تــەلارە، خــاوەنی بڕوانامــەی

دکتۆرایـــە، بـــەڵام هـــیچ دڵخـــۆش نیـــە بـــەو ژیانـــەی، چـــونکە نازانێـــت چـــۆن مامەڵەلەگەڵ خەڵکیدا بکات، ئەوە کەسێکی زۆر لاوازە.

لـــەنێو یـــەکێك لـــە٥٠٠ کۆمپانیـــا ســـەرکەوتوەکانی جیهانـــدا، پیاوێـــك کاریـدەکرد لـەبواری ڕاوێـژکاری کارگێریـدا، سـەرۆکی ئەنجومـەنی کـارگێڕی ئەو کۆمپانیایە زۆر هاوڕێمە.

پێی وتم: ئەمەوێ ئەم پیاوە دەرکەم.

وتم: بۆچی؟

وتـــی: پیـــاوێکی چـــاکە، ڕوێـــژکارێکی بێوێنەیـــە، بـــەڵام نـــاتوانین لەگەڵیـــدا بگـــونجێین، ناتوانێـــت زاڵبێـــت بەســـەر خۆیـــدا، زۆر زو هەڵدەچـێتو تـــوڕە دەبێـــت، بۆیـــە بەرلـــەوەی دەریبکـــەین بڕیارمانـــدا کەســـێکی پـــسپۆڕ لەگەشەی مرۆیی لەگەڵیدا بدوێت.

کاتـــێ لەگـــەڵ ئـــەولاوەدا قـــسەم کـــرد، بیـــنم بەڕاســـتی توڕەیـــە، ســـەرەتا پرســـیارم لێکـــرد لـــەبارەی بـــەهاوە، پـــێم وت چـــی بـــەلای تـــۆوە گرنگە؟چـــی بـــەلای ژیـــانی هاوســـەرداریو کەســـێتی تـــۆوە گرنگـــە؟ بیـــنم ژمـــارە ٢٤ لـــەزنجیرەی بەهاکانیـــدا ئـــەویش متمانەیـــە، ئـــەو متمانـــەی بـــەهیچ کەســـێك نییـــە تەنانـــەت بـــەخودی خۆیـــشی، هەرلەمناڵیـــەو ڕاهـــاتوە متمانـــەی بەکـــەس نـــەبێت، پێـــی وتـــراوە، پێداگریـــە، چـــونکە خـــەڵکی دڕنـــدەنو متمانـــە بەکـــەس نەکـــەیت، هـــەمو کەســـێکی ڕەت ئـــەکردەوە کەبیـــەوێ لێـــی نزیـــك بێتـــەوە، ئەوکەسەشی دەرئەکرد بیویستایە دەستوەرداتە ژیانی.

هەوڵمـــدا لەگـــەڵی تـــاکو تـــوانیم متمانەکـــەی بخەمـــە پلـــە١٠ لـــەزنجیرەی بـــەهاکانی، پـــێم وت: ئـــەو کەســـەی متمانـــەی بەخـــەڵکی نییـــە بێگومـــان متمانـــەی بـــەخودی خۆشـــی نییـــە، بـــەڵام هـــەردەبێت شـــتێك

لەکەسێکدا بدۆزیتەوەو متمانەی پێبکەیت، پاشان دەستبکەیت بەمامەڵەکردن لەگەڵیدا، دەبێت گیانی لێبوردنت هەبێت لەبەرامبەر هەڵەیەك یان تاوانێکیدا، لەڕێگەی ئەم لێبوردەییەوە بەرامبەر بەو کەسە ئەوا بەرەو ڕێگەی چاکەدەچیت، بەڵام مادام تۆ دەرگا بەڕویدا دادەخەیتەوە ئەوا خوای گەورەش دەرگاکان بەڕوی تۆدا دادەخاتەوە، چونکە یەکێك لەدەرگاکانی خێرت داخستوە، یاسایەکی شەرعی دەڵێت: پاداشت بەپێی جنسی کارەکەیە، گەر بەچاکەڕوبەڕوی خەڵکی بیتەوە دڵنیابە چاکەش بەرۆکت پێدەگرێتەوە، گەر بەرِق و قینەوە ڕوبەڕویان بیتەوە دوبارە هەمانشت بەرۆکت پێدەگرێتەوە، گەر بەبێ متمانەییەوە ڕوبەڕویان بیتەوە هەمانشێوە بەرۆکت پێدەگرێتەوە، ئەمانەش سەرجەمیان بونە هۆی گۆڕانکاری لەو پیاوەدا، بەڵام گۆڕانکاریەکەنەگەیشتە ئەو ئاستەی بتوانێت مامەڵەی لەگەڵ خەڵکیدا پێبکات، سەرەنجامەکەی دەرکردنی بوو لەکارەکەی.

بەڵام ئێستا ئەو پیاوەبۆتە سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێڕی کۆمپانیایەکی ئەمریکی لەکەنەدا، ئەمەش بەهۆی ئەوەی تواناکانی ڕاپەڕاند دەرکی بەوەکرد متمانە بەخۆبوون و متمانە بەخەڵکی بوون دەبێت هەبێت لەگەڵ پێداگریدا، ئەوکات هاوسەنگیەکی تەواو دێتە گۆڕێ، دەستدەکاتە کارلێککردن لەگەڵ خەڵکی لەگەڵیاندا لەبرەودایە، هاوکاریان دەکات.

من کاتی سەرکەوتنی بێسنورم نوسی کەتوێژینەوەیەکەوەرگێڕاوەتە سەر سێ زمان، لێپێچینەوەم لەسەر ژیانی سەرکەوتوەکانی جیهاندا کردوە، کاتێ هاتمە جیانی عەرەبیەوە بینیم هێزێکی نەبڕاوەمان هەیەو

پەککەوتوەکانمان گەشتونەتە بالاترین پۆستی جیهان تەنانەت نابینامان هەیە بۆتە ڕاگری ئەدەبی عەرەبی.

کاتێ من لەکەنەدا بووم لێکۆڵینەوەی ژیانی سەرکەوتوەکانم کرد، لەنێویاندا (هینری فۆرد) لەگەشتەکانی بەرەو سەرکەوتنیدا حەوت کەرەت بەچۆکدا هاتوە، بەلام ماندونەناسانە تواناکانی خستۆتەوەگەڕو تەپو تۆزی ناتوانایی لەخۆی کردۆتەوە، توانیویەتی سەرکەوتو بێت، گروپی ئەندازیارانی پێك هێناوە، شتی نوێیان داهێناوە، لەبازاڕەکانی جیهاندا نمایشیان کردوە، سەرکەوتووش بوون، ئەوەش لەقەیرانی ڕاستیەکاندا، حەوت کەرەت توشی شکست بوە، هەرکەرەتەو ٥ ساڵی خایاندوە قەرزێکی زۆریشی لەسەربوە، بەلام نائومێد نەبووە، تواناکانیان خستۆتە گەڕو کاریان پێکردوە.

پیاوێکی تر بەناوی(کولونیل ساندرز) پیاوێکی بەتەمەن گەیشتبویە ٧٠ ساڵان خانەنشین کرابوو، هەرچیەکی هەبوو هەمووی شتی سادەو ساکاربوون، یەکەمین چەکی خانەنشین کردنەکەی کەمتر لە١٠٠ دۆلار بوو، بۆیە لەداخاندا ئەوچەکەی وەرگرتو دڕاندی، وتی من ناتوانم بەمشێوەیە بژیم، هەستا بە ئامادەکردنی لیستی ئەو خۆراکانە خۆی دروستی کردبوون ئەویش بیرۆکەی چێشتخانەکانی(کنتاکی) پێکەشی زۆرێك لەچێشتخانەکانی کرد، زۆریان ڕەتیان کردەوە، بەلام دوای دان بەخۆدا گرتنێکی زۆر بویە خاوەنی بەناوبانگترین چێشتخانەی جیهانی کەتیایدا ١٢٠٠٠ کارمەند کاری تێدا دەکات لەسەر ئاستی جیهانی، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەم پیاوە توانی خەونەکانی بژیەنێتەوە ئامانجەکانی بەدی بێنێت.

ئێستا حاڵی تۆ چۆنە..هەوڵبدە لەگەڵ مندا بیربکەیتەوە لەهەر چیرۆکێك بۆت ئەگێڕمەوە، هەرلەئێستاوە بڕیار بدە، ببزوە، لورنیە ئەمڕۆت دوایین ڕۆژی ژیانت بێت.

دوبارە (توماس ئەدیسۆن) ئەم پیاوە زۆر سەرنجی منی کێشکردوە کاتێ بەدوادا چونم بۆ کەسایەتیە ناوداروسەرکەوتوەکان ردوە، نزیکەی ٢٠٠٠ داهێنانی کردوە، هیچ کامێکیش لەو داهێنانانەی بەئاسانی نەهاتونەتە گۆڕێ، کاتێ هەوڵیداوە بۆ بەدیهێنانی گڵۆپی کارەبایی ٩٩٩٩ شکستی خواردوە، خەڵکیش پێیان وتوە، کەسێکی دۆڕاوە، ئەمیش وتویەتی: من نادۆڕێم، چونکە٩٩٩٩ جار هەوڵمداوە لەهەوڵی١٠٠٠٠دا سەرکەوتنم بەدەست هێنا.

هەروەها (هیلین کیلەر)و(توماس ئەدیسۆن)و(هینری فۆرد)و(لویس بریل) و(رون سکایر) ئەمانە سەرجەم تواناکانیان خستۆتەگەڕ خۆڵو تۆزی نەتواناییان لەخۆیان تەکاندوەو سەرکەوتنی ڕاستەقینەیان بەدیهێناوە.

ئەمەش (لیت هۆندا) لەژاپۆن، ئەوانە تەنگەژەو سەختن لەدنیادا بەسەر ئەم پیاوەدا هاتوە، کاتێ منداڵ بوو خەونی دەبینی بەوەی کەگەورە بوو بێتە شتێکی گەورە، ئێستا خاوەنی گەورەترین کۆمپانیای(هۆندا)ی ئۆتۆمبێلە، ئاواتی ئەوەبوو ئۆتۆمبێلێك بەناوی خۆیەوە بێت (هۆندا) هاوکات ئۆتۆمبێلەکانی (تویۆتا) سەرکەوتنێکی بەرچاوییان بەخۆیە دەبینی، ئەویش بەردەوام لزانکۆدا دەیخوێند، هاوکات کچێکی دەستنیشان کردبوو دەبوو بەوزوانە بچێتە هاوسەرگیریەوە، پێشنیارکرا ماتۆڕێك دروست بکات، بۆیە دانەیەکی

دروسـت کـرد، بـەڵام بـەدڵیان نـەبوو، دیسان گەڕایـەوە بـۆ خوێنـدن، تـاکو دانەیـەکیتری دروسـتکرد، تاسـەرەنجام لێـی وەرگـیرا، بـەڵام حکومـەتی ژاپـۆنی ئەویشی ڕەتکردەوە، پاشان سێ ساڵی تریش بـەردەوام خوێنـدی بەخۆڕاگریـەو کاریـدەکرد، تـاکو ڕەزامەنـدی حکومـەتی ژاپـۆنی بەدەسـت هێنـا، بـەڵام خـاوەنی ئـەو داراییـە نـەبوون تـاکو کارگەیـەکی بـۆ دامـەزرێنن، بـەڵام هەرچـۆنێك بـوو کارگەیـەکیان بـۆ دروسـتکرد، کەچـی لـەکاتی جـەنگی جیهـانی دووەمـدا کارگەکـەی خـاپورکرا، چـوار سـاڵی تـری خایانـد تـاکو کارگەیـەکی دیکـەی دروسـتکرد، ئـەویش بـەر زەمـین لەرزەیـەکی بەهێزکـەوتو خـاپور بویـەوە، گـەر هەرکەسـێکی تـر لـەجیاتی ئـەو بوایـە دەیـوت ئـەم هـەموو بەدبەختیـە چـیە ڕوی لـەمن کـردوە، بـۆ بەتـەنها کارگەکـەی مـن دەبێـت وێـران بێـت، بـەڵام نەیهێـشت نائومێـدی ڕوی تێبکـات، بـەردەوام بـوو لەدروسـتکردنی ماتۆڕەکـانی، کەخـەڵکی دەیـانبینی سەرسـام دەبـوون، دوایەکاریـەکی زۆری خـەڵکی ڕوویتێکـرد بـۆ ماتۆڕەکـانی لەهەفتەیەکـدا ٢٨ داواکـاری مـاتۆڕ ڕوویتێکـرد، پاشـان هـەواڵی داهێنانەکـەی بەسـەر کۆمپانیاکـانی ژاپۆنـدا بڵاوەیکـرد، داواکاریکـان لەسـەری کەڵەکـەبوون، سـەرەنجامیش یەکـەمین مۆتۆسـکێلی لەجیهانـدا هێنایـە کایـەوە، باشـترین خـەڵاتی ئیمپراتـۆری ژاپـۆنی لەسـەر وەرگـرت، دوای ئەمـە دەسـبەکار بـوو لەدروسـتکردنی ئۆتـۆمبێلی هۆنـدا کەبەسەرتاسـەری جیهانـدا بڵاوەیکـردوە، ئاواتـەی هاتـە دی، ئەمـەش هێزی سەرکەوتنە.

ئەمـەش نمونـەی کەسێکەتواناکانی بـەئاگا هێنابێـت داهاتویـەکی پرشـنگداری بۆخـۆی دابـین کردبێت،هـەموو هیـواو ئاسـۆکانی واڵابـن بـۆ

خـەڵکی، دوایـی بڵاویونـەوەو فراوانبـونی هۆنـدا تەشـەنەی کـرد، گـەر هۆنـدا بەمجۆرە بێت ئەی منو تۆ بۆ وەك هۆندا نەبین.. ئاخر بۆ؟

ئێستا وەرەو بادەسـت بکـەین بەیەکـەم هـەنگاو بۆئـەوەی تـۆزو غوبـاری نـەتوانایی بتـەکێنین تواناکانمـان بـەئاگا بێـنین، ئەودێوەزمەیـەی ناخمـان راچڵەکێنینو چالاکی بکەین....

## راچڵەکاندنی تواناکان:

راچـــڵەکاندنی تواناکـــان بەپـــەیبردن، بەپـــەیبردن دەســـت پێـــدەکات یەکـەمجار بزانـە تـۆ کێیـت؟ پاشـان هەربـەو شـێوەیەی کەهـەیت خۆتـت پـێ قبـوڵ بێـت، چـونکە پێبـاش بـونی خـودی بەشـێکەلەخۆنرخاندن کەواتـە هەردەبێت خودی خۆتت پێ پەسەند بێت

خۆنرخاندنیش لەم سیانە پێك دێت:

یەکەم:قبوڵ کردن..خودی خۆتت پێ قبوڵ بێت هەرچۆنێك کەهەیت.

دووەم:خۆنرخانـدن..بـەهای خـۆتو ئەزمونـەکانت، بیرۆکـەکانت، تـاقی کردنەوەکانت بزانیت.

سێیەم: خۆشەویسـت خـود: مـادام خـوای گـەورەت خـۆش دەوێـت بێگومـان دەبێـت بەخـشینەکانیت خـۆش بوێـت، تـۆ خۆتـت خـۆش دەوێـت، خۆتـت پـێ پەسـەندە، ڕەنگـت، بـەژنو بـاڵات، بـاكو داکـت پـێ قبـوڵ بێـت، نـاوی خۆتـت پـێ پەسـەند بێـت، گـەر ئـەم پـێ پەسـەند بـوونو نرخاندنـە نـەبێت، ئـــەوا لاوازی لەوێنـــەی خودیـــدا دروســـت دەبێـــت، لاوازی لەبـــەدیهێنانی خودیدا، لاوازی لەخۆنرخاندندا دێتە کایەوە.

دەبێـت دوای پـەیبردنی ڕاسـتەخۆی خـۆ پێپەسـەند بـوون، تـۆ باشـترین بـەدیهێنراوی خـوای پـەروەردگاریت، پێویـستە جیـاوازی بکـەیت لـەنێوان

خـۆت و ڕەفتارەکانتـدا، دەبێـت خۆتـت پـێ پەسـەند بێـت وەك ئـەوەی هـەیت بەدرێـژی و پـانی و ڕەنـگ و شـێوە و جـۆر، چـونکە خـوای گـەورە گـەوردونی بـۆ ملکـەچ کردویـت، ئاسمانـەکان و زەوی، هەرچـیەك لەنێوانیاندایـە، زۆرجـار دەبینیـت کەسـێك ئەنـدامێکی بـەزکماك ناتـەواوە بـەڵام، زۆر هۆشـیار و زرنگـە (جیمـالا بیزانـی) کەمئەندامێکـە و ١٢٠٠ کەمئەنـدامی وەك خـۆی بـەڕێوە ئـەبات، ئـەم خۆپـێ پەسـەند بوونـە بـەرەو پێـشت ئـەبات، چـونکە هـیچ گرێیـەکی دەرەونیـت بـۆ ناهێڵێتـەوە، گـەر کەسێك تانـەت لێبدا لەبـەر ئـەوەی پـان یـان درێـژ یـان کورتـە باڵایـت یـان لەبـەر ناوەکـەت یـان لەبـەر نـاوی دایکـت یـان باوکـت یـان خێزانەکـەت، ئەمانەهیـچیان کاریگـەری لەسـەرت نابێـت، بـەڵکو بـەخۆت ئـەڵێیت: ئـەوە دەگـۆڕم کەشـیاوی گۆڕینـە، ئـەوەی شـیاوی گـۆڕین نیـە، یـان وازی لێـدێنم یان پەسەندی ئەکەم.

لـەم ڕووەوەوتەیـەك دەڵێـت: اللهـم اعـني علـى تغـيير مـا أسـتطيع تغـييره وتقبل مالااستطيع تغييره ومعرفة الفرق بينهما

هاوڕێیـەکم هـەبوو خـاوەنی نوسـینگەیەکی پـارێزەری بـوو لـەمۆنتریال لـەم نوسـینگەیەدا ٣٢ پـارێزەر کاریـان دەکـرد، پاشـان ١٠ سـکرتێریان هێنـا هـەموو ئـامێرێکی پێـشکەوتویان بـۆ دەسـتەبەرکردن، پاشـان مەشـقیان پێکـردن لەسـەر کـارپێکردنی ئامێرەکـان، بـەردەوام لەگەڵیانـدا خـەریك بـوون بـۆ مـاوەی شـەش مـانگ، لـەدوای ڕاهـاتنی سـکرتێرەکان دوایـەکی زۆری کاریـان لەسـەر بـوو، کەچـی یـەك لـەدوای یـەك دەسـتیان لەکارکێـشایەوە، پاشـان کارمەنـدی نوێیـان دامەزرانـد بـەڵام کـاتی پێویـستیان نـەبوو بـۆ ڕاهێنـانی ئـەم سـکرتێرە نوێیانـە، ئـەوان

کۆمپیوتەریان وەك چاپکەرێك بەکاردێنا، چونکە دەرکیان بەتوانای ئەم ئامێرە نەکردبوو، بەڵام گەر شارەزاییان هەبوایە بەهێزو توانای کۆمپیوتەر ئەوا بەشێوازێکی دروست بەکاریان دەبرد، هەروەك ئامێری چاپکردن چۆن یەکەمجار بەیەك پەنجە کەسەکەچاپدەکات، پاشان دوای ئەوە هەموو پەنجەکانی بەکار دێنێت، گەر بێت و هەر دەپەنجەکەی بەکار ببات ئەوا زۆر بەخێرایی ئەتوانێت بنوسێت هەرچەن لەسەرەتاوە کارێکی گرانە بەڵام دوایی لەگەڵیدا ڕادێت تاکو ئەتوانێ لەخولەکێکدا ١٠٠ووشە بنوسێت، بەڵام گەر بەردەوام بێت لەسەر بەکاربردنی تەنها پەنجەیەکی ئەوا مەحالەبتوانێت لە٣٠ ووشە زیاتر تێپەڕ بکات ئەمەش پێیدەوترێت پەیبردن، گەر پەی بەتواناکانت نەبەیت هیچی لێنەزانیت ئەوا ئیتر چۆنیان بەکار ببەیتو مامەڵەی پێوە بکەیت؟

لەدەمێك ساڵەوە چاوپێکەوتنم لەگەڵ پیاوێکدا کرد، پێی وتم: کوڕی خۆم، تۆزۆرشتت پێ وتوین،بەڵام ئەم دنیایە تەنها ووشەیەکەئەویش( پەیبردن) منیش کەوتمە لێکۆڵینەوەی ووشەی(پەیبردن) نزیکەی سێ ساڵ گەشتمە ئەوەی بەبێ پەیبردن هیچ شتێك گۆڕانکاری نایەت بەسەریدا، گەر پەی بەوە نەبەیت تۆ زۆر ئەخۆیت ئاگات لەزۆرخۆری خۆت نیە، گەر پەی بەوە نەیت تۆ کەسێکی تورەیت، ئەوا گۆڕانکاری بەسەر خۆتدا ناهێنیت، گەر پەی بەوە نەبەیت تواناکانت بەکار نەهێناوە هەست بەبەکارهێنانیان ناکەیت، گەر پەی بەوە نەبەیت جگەرەکێشان مەترسیدارە بۆدین و تەندروستیت ئەوا هەوڵی ئەوە نادەیت لێی دور بکەویتەوە، کەواتە پەیبردن هەموو

شــتێکە، بۆیــە بۆمەدەرکــەوت گــرنگترین شــتە، پــەیبردن ســەرەتای گۆڕانکاریــە، گۆڕانکــاری ســەرەتای گەشــەکردنە، گەشــەکردن ســەرەتای پێــشکەوتنە، پێــشکەوتن بــەبێ پــەیبردن بــەدی نایــەت، گــەر پــەی بــەتواناکانت نەبــەیت ناتوانیــت بــەکاریان ببــەیت، چــونکە ئاســتەنگو پێشهاتەکان لەگۆڕێن ئێمەش بەوانە فێردەبینو گەورە دەبین.

گــەر مــرۆڤ بەئاســانی ســەرکەوتن بەدەســت بێنێــت بــەبێ هــیچ ئاستەنگێك ئەوابــەزۆری نیگــەرانی ڕوبتێــدەکات ئەمــەش زاناکــانی زانکــۆی (هارفــارد) ســەلماندویانە مــرۆڤ گــەر بــەردەوام لەخۆیــدا بێتئــەوا بێگومــان دوچاری خەمۆکی ئەبێت.

گــەر بەڵگــەت ئــەوێ لەســەر ئــەم بیروڕایــە ســەیرێکی دەوڵەمەنــدەکانی جیهــان بکەئەوانــەی مانــدو نــەبوون بەبەدەســت هێنــانی ســەروەتەکانیانەوە دەبینیــت٩٢٪ بەدەســت نیگەرانیــەوە ئــەناڵێنن، چــونکە خــاوەنی هــیچ ئــەزمونو تاقیکردنەوەیــەك نــین، هــیچ فێــر نــەبوون، لــەهیچ شــتێکدا مانــدوو نەبوون وەك موتەنەبی ئەڵێت:

بقدر الجد تكتسب المعالي    ومن طلب العلا سهر الليالي

ومن طلب العلا بغير جد    اضاع العمر في ظل المحال

مــن لــەبارەی ئــەو دەوڵەمندانــەوە ئــەدوێم کــەخاوەنی ســەروەتو سـامانن لەڕێگــەی میراتــەوەیان بــاوكو دایکــەوە بۆیــان جێمــاوە، هــیچ مانــدو بونێکیــان پێــوە نەکێــشاوە، شکــستیان نــەخواردوە هەڵنەســاونەتەوە، هــیچ دەســکەوتێکی خودییــان نیــە، ســەرەنجامیش هەرنیگــەرانی دەبێتــە پــشکیان، گــەر کــات بــەفیڕۆ بــدەیت چــاوەڕوانی هــاتنی بــەختو ئیقبــاڵ بکــەیت خۆیــت بۆبکــات بــەزۆردا ئــەوا بەتــەمای مەبــە هــەرگیز، مــن دڵنیــات

ئەکەمەوە، تۆ دەڵێیت: ئەی بۆ ئەوانە خاوەنی بەختو شانسن؟ منیش پێت ئەڵێم: چونکە گەر توشی شکست بوون ئەتوانن جارێکیتر سەرپێی خۆیان بکەونەوە، خوای گەورەش ئەفەرموێت:

إنا لانضيع أجر من احسن عملا

ئەوانە شارەزاییەکی تەواویان هەیە بۆیە خاوەنی ئەو شانسەن چونکە گەشبینن، مادام ئەوانە هێندە گەشبینن بەختیش بەلای ئەواندا خۆی دەکوتێ ئەوانیش بەلای بەختدا خۆیان ئەکوتن.

کەواتە هیوای خێربخوازە باخێرت دەسگیربێت:

وەك خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا فێرمان دەکات(اقرأ) ئەمە یەکەمین ئایەتی قورئانی پیرۆزە، فەرمانێکی ڕاستەخۆیە بۆئەوەی هێزی ئەقڵت بخەیتەگەڕ.

دەڵێم گەشبینبە، ئەمەش فەرمانی داخوازیە، ڕاستەوخۆیە بەردەوامە لەکاتداواتە خێر هۆکارێکە، ئەی ئەنجام؟! ئەویش دەسگیربوونە، هیواخوازی خێربە بادەسگیرت بێت، هەرکات گەشبین بیت بەهەرشتێك ئەوەت دەسگیر دەبێت، ئەمەش لەیاساکانی چالاکی ئەقڵی ناوەکیە دەڵێت: بیر لەهەرشتێك بکەیتەوە تەشەنە دەکاتو فراوانی بەوجۆرە وەردەگرێت، گەر بیرلەگەشبینی بکەیتەوە خۆی بەرەولای تۆ کێش دەکات بەجۆرەی تۆ بیرت لێکردۆتەوە، بۆیە بیرلەچاکەبکەنەوە بادەسگیرتان بێت، بەمەش پێ دەنێیتە یاسای کێش کردنو یاسای گەڕانەوە..یاسای لایەنە مەترسیدارەکان.

خوای گەورە فەرمان بەهەرشتێك بکات بیبە دەبێت، کەواتە دەبێت گوێڕایەڵی خوای پەروەدگاربیت، خۆشت بوێت ئەمەکداربیت، خوای

گەورەش هەرچیت بوێ بۆت فەراهەم دێنێت، کەواتە دەبێت لەخوای گەورە نزیك بیتەوە، خەڵکیت خۆشبوێت دەستی هاوکاریان بۆدرێژ بکەیت وەك دەفەرموێت:إنا لانضیع أجر من احسن عملا...وبشر الصابرین

ئێستاکاتی ئەوە هاتوە بڵێیت: من خۆمم پێ قبوڵە وەك ئەوەی کەهەم.

گەر سەرنجێکی سێ براکەبدەین دەیانوت ڕۆژێك لەڕۆژان دەتوانین فڕۆکەدروست بکەین، لەوکاتەدا هەرگیز فڕۆکەلەئارادا نەبوو، یەکێکیان پەڕی لەبەرکردو سەرکەوتە سەر شاخێك، وایدەزانی گەر پەڕ لەبەربکات دەتوانێ وەك باڵندەکان بفڕێت، هەرکەلەسەر شاخەکەوە خۆی هەڵدا کەوتە خوار، چونکە یاسای کێشکردنی لەبیرکردبوو، بۆیە کەوتو بردیانە نەخۆشخانە، کەدووەمیان سەرکەوتە سەر شاخەکە ئەویش هەمانشێوەی بەسەر هات، خەڵکی پێی دەوتن برا شێتەکان، چونکە هەوڵێکی زۆریان دا، هەوڵی گۆڕینی پەڕەکانیاندا هەرجارەو جۆرێکیان بەکاردێنا، هەموو جارێکیش شکستیان دەخوارد، دوای ئەوە ڕێیان کەوت لەیاسای سەرئاو کەوتن کاتێ ئەم یاسایەیان دۆزیەوە وتیان: یاسای کێشکردنی زەوی دەڵێت: هەرشتێك لەهەوا قورستر بێت نافڕێت بەڵام، توانیان لەڕێگەی یاسای سەرئاو کەوتنەوە بفڕن، بەڵگەش فڕۆکە لەهەوا قورسترەو دەشفڕێت، پاپۆڕیش ناتوانێ سەرئاو کەوێت مەگەر لەتەختە دروستکرابێت بەڵام لەڕێگەی یاسای سەرئاوکەوتنەوە دەتوانێت سەرئاوکەوێت هەرچەن لەئاسنیش دروستکرابێت.

ئیتر ئەو خەڵکەی گاڵتەی پێدەکردن ڕیزیان گرتوە وەستاوون دەیانەوێ بەو فڕۆکەیە گەشتبکەن کەئەو سێ برایە دایان هێنا.

ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە تواناکانت بەکاربێنیت، ئەو دێوەزمەیەی ناخت راچڵەکێنیت، لەمەبەستەکەدا چڕبیتەوە، ئامانجەکەت بدەرەوە دەست خوای گەورە، ئێمە زۆر بەدرێژی لەوبارەیەوە دواین، ئیتر باباسێکیش لەبارەی (چۆن ئاینده دروست ئەکەیت)

یەکەمین شت پەیبردنە، پەی بەوە بەریت تواناکانت بێسنورن، دوای ئەوە خودی خۆت پێقبول بێت، هەرچەن خەڵکی گاڵتەت پێبکەن، ئەمەت لەبیرنەچێت، بەخۆت بڵێ: تۆ باشترین بەدیهێنراوی خوای پەروەدگاریت، وەك وتەیەکی ئینگلیزی دەڵێت: ئەوزەبرەی نەمکوژێت بەهێزم دەکات...

هیچ کەسێك ناتوانێت کاریگەری لەسەر تۆ هەبێت بەبێ خواستی خۆت، هیچ کەس ناتوانێت وات لێبکات هەستی هیچ شتێك بکەیت بەبێ خواستی خۆت، هەر فاکتەرێکی دەرەکی بیەوێت کاریگەری لەسەر تۆ دروست بکات حەتمەن خواستی خۆتی لەسەرە، تەنها خودی تۆیە بیری لێدەکاتەوە بۆیە ئەویش کاریگەری لەسەرت دەبێت، تەنها هەرتۆیت هەستی خۆتی بۆ تەرخان ئەکەیت، پەرچەکرداری لەبەرامبەردا ئەنوێنیت، کەواتە بەدوربە لەکارتێکەرە دەرەکیەکان، تۆکەسێکی رێك و پێك و تەواویت، دڵنیابە ئەوەی گاڵتەت پێدەکات، رۆژێك دێت لەبەردەمتا دەوەستێت پێویستی پێت ئەبێت ئەمەش یاسای بوونی گەردونە، هەرکەسێك توانا و ئامانجی هەبێت دەبێت دەسبەکاربێت بۆ بەدیهێنانی.

خوێندکارێکی زانکۆی (بین) ناوی(رۆجەر بانستر) پاڵەوانی ئۆلۆمپیاتی١٠٠مەتری ٢٠٠مەتری ٣٠٠ مەتری کاتێ خوێندکار بوو

بــەهاورێکانی دەوت:ئایــا دەزانـــن مـــرۆڤ ئــەتوانێت یــەك میــل لــەماوەی ٤ خولەکـدا ببڕێـت، هەنـدێك سـەیری ئـەویتریان دەکـردو هەنـدێکیتر گاڵتــەیان پێـدەکرد پێیــان دەوت، هـیچ جەسـتەیەکی مرۆیـی ناتوانێـت ئـەو ماوەیــە بـە٤ خولـەك ببڕێـت، بەئـەقڵی هـیچ کەسێکیـشدا نایـەت، بـەڵام خـۆی خـەریك نەکرد بەو قسانەوە بۆی دەرچوو.

گـوێی نـەدا بەقـسەی ئەوانـەی جوڵەیـەکیان لـەباردا نـەبوو، شکـستی بـۆ دۆڕاوەکـان بـەجێ هێـشت، بـڕواو تـوانی میلێـك لـەماوەی ٤خولەکـدا ببڕێـت، پێیــان ووت دوبـارەی بکــەرەوە، دوبـارەی کـردەوە، پێیـانوت جـارێکیتریش دوبــارەی بکـــەرەوە ئـــەویش ١٤جـــاری بـــۆ دوبـــارە کردنـــەوە، بۆهـــۆی تواناکانــە بیروڕاکــان لەبــەین دەچــن، هەرلــەو ســاڵەدا ١٦ کەسـیتریش هاتنــە ریــــزەوە، ئێـــستا زیـــاتر لـــە٣٢٠٠٠خوێنـــدکار زۆر لێهـــاتوون لـــەوبوارەدا، هۆکــاری ئەمـــەش تـــەنها کەســێکی بڕیــاردەر بــوو، لەناخــەوە خــۆی پــێ پەسـەند بـو، توانـا بێـسنورەکانی خـستەگەڕ، گـەر ئـەم خوێنـدکارە گـوێی بـۆ قـسەی خـەڵکی بگرتایــە نەیـدەتوانی ئـەوەی لێ بوەشـێتەوە، چـونکە کــارێکی گرانــە یــان مەحاڵــە، ئەوتوانایــەی نــەبوو ئــەوە بکــات کــەتوانی میلێك لەماوەی چوارخولەکدا ببڕێت.

دەبێــت پــەی بــەریت بــەهێزو تواناکانــت، گـوێ بـۆ قـسەی هـیچ کەسـێك نـەگریت، چـونکە تـۆ لـەوە گـەورەترو بـەهێزتریت کـەبیری لێدەکەیتـەوە، کەواتــە دەبێــت تــەرکیز بکەیتــە ســەر توانــا بێـسنورەکانت، پـشت بـەخوای گـەورە ببەسـتیت، دڵنیابیـت لـەوەی خـوای گـەورە چـاکەی چـاکەکاران وون ناکات، خوای گەورە لەگەڵ خۆڕاگراندایە.

کەواتــە یەکــەمین شــت پــەیبردن، پاشــان خۆپێپەســەند بــوون، دوایــش بڕیار.

ئێستا لەگەڵ مندا ئەم ووتەیە بنوسە:

بڕیارمــدا پــەی بــەتواناکانی خــۆم ببــەم، بڕیارمــدا بــەکاری بێــنم، بڕیارمــدا شــوێن پەنجــەی خــۆم لــەدنیادا بــەجێ بـێڵم بــەو ڕەوشــەی خــۆم، نــەك بــەو ڕەوشـــەی بەســـــەرمدا ســـــەپێنراوە لەمناڵیمـــــەوە، بـــــەڵام بڕیارەکـــــەم بەوشێوازەبێت کەخۆم دەمەوێت بەڕەوشی خۆم بێت.

کاتێـك مــن منــاڵ بــووم زۆرێـك پێیــان دەوتم: تــۆ ســەرکەوتو نابیــت، هــەرگیز پێیــان نــەدەوتم دەبیتــە پاڵــەوانی جیهــانی، یــان بەڕێوەبــەرێکی ســەرکەوتو، یــان کەســێکی وتاربێــژی جیهــانی، ئەمانــە هــەمووی لــەجیهانێکی نادیــاردا بــوون، خــوای گــەورە ئیلهامــەکانی پێبەخــشیم، گــۆڕان بــەهێزترە لــەبیرو بــاوەڕ، چــونکە بــیرو بــاوەڕ لەکەســوکارەوە یــان لــەجیهانی دەرەکیــەوە وەرمــانگرتوە، بــەڵام لەناخــدا دەنگێــك پێــت دەڵێــت: تــۆ ســـەرکەوتو دەبیــت، منــیش هەســتمدەکرد دەبمــە بەڕێوەبــەرێکی ســەرکەوتو، دەبمــە پاڵــەوانی یــاری تێــنس، هەرچــەن گاڵتــەیان پێــدەکردم، بــەڵام لەناخمــدا ئیلـهامێکی خوداوەنـدی هــەبوو هــانی ئــەدام بــۆ ســەرکەوتن، ئــەو ئیلهامــە دەتبزوێنێت، یان هەرشتێکت تێدا بێت دەیخاتە بزاڤ.

وەك شاعیر دەڵێت:

کان حلما فخاطرا فاحتمالا   ثم اصبح حقیقة لاخیال

تـۆ خـەونێکت هەیـە، پاشـان بـیری لێبکـەوە دوایـی دەبێتـە ئەندێـشە ئـەوجا دەبێتە کردار دوایش دەبێتە ڕاستەقینە نەك خەیاڵ.

هـەموو ڕاستـەقینەو داهێنانـەکان ڕۆژێـك لـەڕۆژان خـەون بـوون، دوایـی بیریـان لێکراوەتـەوە، بۆتـە ڕاستەقینەیەکی نـاوەکی، کاتـێ خاوەنەکـەی سـەیری ئەوڕاستـەقینە ناوەکیـەی کـردوە وێنەیـەکی ڕاسـتەقینەی بینیـوە، ئـەنجا دەسـتی کردۆتـە بیرلێکردنـەوەی، ئـەم وێنەیـەی گـەورە کردوەتـاکو هێناویەتـە زەمینەیـەکی کـردارەوە، دوایـش کردوێتـی بەڕاسـتەقینەو نەیهێـشتوە هـەروا بەخـەیاڵ بمێنێتـەوە، هـەروەك ئـەو سـێ برایـەی فڕۆکـەیان داهێنـا، وەك ئەوانـەی ڕۆکێتیـان داهێنـا، یـان هـەموو داهێنـەرانی بوارە ئەلیکترۆنیەکان.

(بلـن) ئـەوەی پێنوسـی جـافی داهێنـا، ئـەوەی خـاوەنی جـوانترین پێنوسـە، ئـەو کـاری دەکـرد لەیـەکێك لـەکۆمپانیاکانی بیمـەدا لەفەرەنـسا، کڕیارێکیـشی لەگەڵـدا بـوو ڕکابـەرێکیش دەیویـست کـارتی بیمـە بفرۆشـێتە ئـەو کڕیـارە، (بلـن) دانیـشت لەگـەڵ کڕیارەکـەدا لـەکاتی نوسـینی گرێبەسـتەکەدا بەپێنوسـێکی مەرەکـەبی تـەڕ کەئێـستاش بـەکار دەبرێـت دەینوسـی پەڕەکـەی هـەموپیس کـرد،(بلـن) پۆزشـی بـۆ هێنایـەوە ڕۆشـت پەڕەیـەکی تـری هێنـاو بۆئـەوەی گرێبەسـتێکی تـر بنوسـن، کاتـێ گەڕایـەوە کڕیارەکـەی لێنـەمابوو، ڕۆشـتبو بـۆلای ڕکابەرەکـەی تـر، بۆیـە (بلـن) زۆر سـەری سـوڕ دەمێنێـت، دەڵێـت چـۆن وادەبێـت، بـەخۆی دەڵێـت: دەبێـت بیربکەمـەوە لەشـتێکی نـوێ مەرەکەبەکـەی لـەناو خۆیـدا بێـت بـۆ ئـەوەی جارێکیتر ئەمە ڕونەداتەوە.

بۆیـە بەڕاسـتی بـیری کـردەوە تـاکو تـوانی پێنوسـی جـاف داهێنێـت، نـاوی لێنـا(مـون بلـن) ووشـەی مـون بـەزمانی فەرەنـسی واتـە: تایبـەت بـەخۆم،

یـان هــی خۆم،یـان مــن ئــەم داهێنانــەم داهێنابویــە (مــونبلن)بەشــۆرەت ترینو باشترین پێنوسە لەجیهاندا.

گــەر بێــتو گرێبەســتی لەگــەڵ کڕیارێکــدا پێــی بنوســرێت، چــیتر مەرەکەبەکــەی ناڕژێــت، ئــیتر ئــەوە ڕوناداتەوەبۆیــە بــیری لــەداهێنانی پێنوسێکی نوێ کردەوە.

یەکــەمین شــت ئەمەیــە پەیبــەریت بــەتوانا بێسنورەکانت، خۆتــت پــێ قبــوڵ بێــت لەناخــەوە، دوای ئــەوە بڕیــار بــدەیت کــەتواناکانت بەکارببــەیت بیخەیتــە مەیــدانی کردارییــەوە، گــەر بڕیــار بــدەیت خــۆت فێــری زمانێــك بکــەیت تەلەفۆنەکــەت بــەرز دەکەیتەوەپەیوەنــدی دەکــەیت و پرســیاری پــەیمانگا یــان دامەزراوەیــەکی ئــەو بــوارە دەکــەیت، کەواتــە دەســبەکاربە فەرهــەنگێك ئامــادە بکــە، ڕۆژانــە هەنــدێك لــەو وشــانەی ئــەو زمانــە لەبەربکە، سەیری بەرنامەی کەناڵەکانی تایبەت بەو زمانە بکە.

ئەمــە دکتــۆر(زکــی عوسمــان) کــەتوانی خــۆی فێــری زمــانی ئینگلیــزی بکــات لەڕێی ڕادیۆوە هەرچەند پەککەوتەو کوێرو ئیفلیج بوو.

چیرۆکی دکتۆر زەکی:

لــــەمانگی ٢ ی١٩٥٢لەگونــــدی الرزيقــــات، مەڵبەنــــدی ئــــەرمنت، ســــەر بــەپارێزگای قنــا، منــاڵێکی نائاســایی هاتــە دنیــاوە، بــاوکی کابرایــەکی ســادەی دینــدار بــوو، چــوار بــراو ســێ خوشــکی هــەبوو، لــەدوای تێپــەڕینی دوســاڵ بەســەر لــەدایك بــونی ئــەم مناڵــە توشــی تایــەکی بــەتین بــوو توشــی ئیفلیجــی منــاڵانی کــرد، چــاوەکانی لەدەســتدا، هــەموو کــارو پیــشەی خێزانەکــەی گــەڕان بــوو بــەدوای چــارەی مناڵەکــەیان، پزیــشکەکان گەشــتنە ئــەو بڕوایــەی هــیچ چــارەیەکیان پــێ نیــە بــۆ ئــەو مناڵــە، خێزانــەی زۆر

دڵگـران بـوون بەقـسەی پزیـشکەکان، بـەڵام وورەیـان بەرنـەدا، بۆچـونەکان لەوخێزانـەدا بـوون بەدووبەشـەوە، بەشـێکیان پێـان بـاش بـوو بیخەنـە نێـو ئاشـێکەوە تـاکو ڕزگاریـان بێـت، بـەڵام بـاوکو دایکـی ئـەو بۆچـونەیان پـێ بـاش نـەبوو، وتیـان بیخەینـە بـەر خوێنـدن، دوای تێپـەڕینی ساڵێك، بـەهۆی کـاری باوکیانــەوە ئەوخێزانــە گواسـتیانەوە بـۆ ناوچــەی (منـشیە الــصدر) بردیـــان بـــۆلای مامۆســـتایەکی خزمیـــان وانـــەی لەبـــەرکردنی قورئـــانی دەوتـــەوە، تاوایلێهـــات منداڵەکەهـــەموو قورئـــانی لەبـــەرکرد فێـــری مانـــاو گـەورەیی قورئـان بـوو. هـەموو پەیوەندیـەکی بـە(صـعید)ەوە بـچڕان وەکـو بەنـدێك لەماڵـەوە مایـەوە تـاکو تەمـەنی گەشـتە ١٦ سـاڵ بـەبێ ئـەوەی بـچێتە هـیچ خوێندنگەیـەك یـان هـیچ دامەزراوەیـەکی فێرکـاری، لـەو ماوەیـــەدا تـــەنها خـــەریکی قورئـــان و لەبـــەرکردنی بـــوو ڕادیـــۆ هـــاوڕێی هەمیشەیی بـوو، بەدرێـژایی ئـەو چـەند ساڵەی وەك بەنـدێك لـەماڵی باوکیـدا لـەڕادیۆوە فێـری ڕۆشـنبیریو سیاسـەت، ئـابوریو پـەروەردەو چـەندین زانیاری تر بوو.

بەڵام لەبارەی خەونەکانی.. ئایا خەونی هەبوو؟!!

کەسێکی کوێرو ئیفلیج دەبێت خەونی چی هەبێت؟

ڕۆژانــە لــەڕادیۆوە گــوێی لــەزنجیرەی(ڕۆژگارەکــان) دەگــرت، ئاواتــەخواز بـوو وەکـو دکتـۆر(تـەها حـسەین) کەسـێکی چاوسـاغ ڕۆمـانی(ڕەگـەکان) دکتـۆر تـەهای بـۆ خوێندبویـەوە، ئـەمیش بەهـەموو هەسـتەکانیەوە گـوێی بۆشـل کردبـوو، ئاواتـەخواز بـوو بێتـە وتاربێـژو، ئیمـام،واعیز، لـەڕادیۆوە فێـری زمـانی ئینگلیـزی بـوو، گـوێی لەبەرنامـە ئەوروپیـەکان دەگـرت، ئاواتەخواز بوو بێتە کەسێکی ناودارو لەناو خەڵکیدا.

لەهەموی سەیرتر ئەوە بوو لەتەمەنی پێنج ساڵیدا دەچویە سەردیواری ماڵەکەی خۆیان‌و بەدەنگی بەرز قورئانی دەخوێند، وتاری ئەدا وایدەزانی وتار بۆخەڵکی ئەدات، ڕۆژانە ئەمەی دوبارە ئەکردەوەتاکو وایلێهات بیە وتاربێژو ئیمام و خەڵکی لێی کۆدەبونەوە.

هەندێك سەرسام بوون بە دەنگی، هێزی کەسێتی، هەندێکی تر دەیانوت ئەقڵی لەدەستداوە، گەشتی خوێندنی دەستی پێکرد لەتەمەنی ١٦ ساڵیدا، لەپۆلی یەکەمی ئامادەیی پەیمانگای عوسمان ماهر بەبێ ئەوەی قۆناغی سەرەتایی بخوێنێت، چونکە هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر بوو، ئەم لاوە سەرکەوتنێکی بەرچاوی بەدەست هێنا، پاشان پەیوەندیکرد بەپەیمانگای دواناوەندی قاهرەوە لەوێش چوارساڵی خوێند، کەدەچو بۆ قوتابخانە یان لەکۆڵ دەکرا یان بەسنگە خشێ دەڕۆشت ئیتر زستان بوایە یان هاوین، بەڵام گەرزستان بوایە حاڵێکی خراپی هەبوو، کاتێ باران دەباری ئەو بەناو قوڕو چڵپاودا خۆی کێشدەکرد.

ئەم لاوە دو هەڵوێستی لەبیر نەکرد:

هەڵوێستی یەکەم: ڕۆژێکی سەختی باران کابرایەك لەوقوڕو چڵپاوە هەڵیدەگرێت‌و سواری پاسێکی ئەکاتو داوا لەشۆفێرەکە ئەکات هاوکاری بکات.

هەڵوێستی دووەم: کاتێك قوتابی دواناوەندی دەبێت، لەمزگەتی ئەزهەر دێتە دەرو هاوڕێکانی لەدەوری دەبن،، ئافرەتێك تاکسیەکی بۆدەگرێتو دەیگەیەنێتە ماڵەوە، بۆ ڕۆژی دواتر هاتەوە چاوەڕوانی کرد هەرپێویستیەکی هەبێت بۆی جێبەجێ بکات، ماوەیەك مایەوە پرسیاری

بۆکرد لەبەر ئەوەی سۆزدارییەکی زۆری بۆی هەبوو، داوایلێکرد، فێری خوێندنەوەی بریلی بکات یان بۆی بخوێنێتەوە، بەڵام ئەم خۆی لێدەرباز کرد، چونکە حەزینەدەکرد خۆی بکات بەبار بەسەرهیچ کەسێکەوە.

لەدواناوەندیدا پیان وت کەوتوە، بۆی بوبە راچڵەکینێك، بەڵام بەخەندەوە پێشوازی لەو هەواڵەکرد، بەڵام بۆیانکرد بەشتێکی کتوپڕو پێیان وت کەدەرچوە، لەدوای تەواوکردنی قۆناغی دواناوەندی پەیوەندیکرد بەکۆلێژی زمانو وەرگێڕانەوە، بەڵام دوای گۆڕینی مەودای بیرکردنەوەکانی بۆچونی گۆڕا، بۆیە پەیوەندیکرد بەکۆلێژی ئوسولی دینیەوە، دوبڕوانامەی لیسانسی وەرگرت لەکۆلێژی ئوسولی دین، لیسانس لەبانگەوازو ڕۆشنبیری ئیسلامی لەساڵی ۱۹۷۹ لیسانس لەتەفسیر ساڵی ۱۹۸۲ دامەزرێنرا لەوەزارەتی ئەوقاف بۆماوەی حەوت ساڵ لەساڵی ۱۹۸۰ بۆ ساڵی ۱۹۸۷ بەمەشەوە نەوەستا، ماجستێری لەساڵی ۱۹۸٦دا وەرگرت بەپلەی زۆرباش، بابەتەکەی" مناهج الاسلام في تنمية الاقتصادية".

پاشان لەزانکۆ کرایە مامۆستای یاریدەدەر لەکۆلێژی بانگخوازی، بەمەشەوە نەوەستا خوێندنی دکتۆرای تۆمار کرد لەساڵی ۱۹۸٥دا نامەی دکتۆرای بەدەست هێنا لەسەر بابەتی" الدعوة الاسلامية في القرن السادس الهجري"

ئەمەش بەپلەی زۆرباشە لەگەڵ مەرتەبەی شەرەفی یەکەم، پاشان بویە قسەکەری ڕادیۆیی، لەپلەدا بەرزبویەوە بویە سەرۆکی بەشی ڕۆشنبیری

ئیسلامی لەکۆلێژدا، ٢٤ دانراوی هەیە لەبواری بانگەوازو تەفسیر رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی.

جگە لەمانەش سەرپەرشتی ١٧ نامەی دکتۆرای کرد لەوانە:

- منهج الاسلام في تحقيق الامن.
- اسباب الارهاب ومظاهر علاجه.
- عوامل التفكك الاسري.
- مجلةالبيان ودورها في نشر الثقافة الاسلامية.
- ذووالاحتياجات الخاصة وموقف الاسلام منهم.

پێت خۆشە ئەوکەسە بلیمەتە بناسیت؟

ئەو کەسە دکتۆر زەکی عوسمانە، ئەوپیاوە ئیفلیجو نابینایەی توانی هەموو قورئان لەبەر بکات، ئەوکەسەی لەماڵەوە بەند بوو، بەدەست هێنەری دوو بڕوانامەی لیسانسو ماجستێرو دکتۆرا، ئەم دکتۆرە نەکەوتە ژێر کاریگەری ئەو داخ لەدڵانەی نەخشەی شکستیان لەخوێندنی باڵادا بۆ دەکێشا، بەڵکو ورەو تینی لەزیادبوندا بوو، نەکەوتە ژێرکاریگەری گاڵتەجاڕی ئەوانە ئەیانویست گاڵتەی پێبکەن، نەکەوتە ژێر کاریگەری هیچ شتێکی سلبیەوە بەڵکو هەموو سلبیەکانی گۆڕی بۆ هێزو تواناو ئەزمونو تاقیکردنەوەکان.

چیرۆکه قۆناغی هاوسەر گیریو سەرکەوتوش بوو لەگەڵ کەسێکی تێگەشتو، لەنێوانیاندا خۆشەویستی پەرەی سەندو خۆشەویستیەك بوو لەپێناوی خوای گەورەدا.

منداڵێکی نابینای ئیفلیج توانی تواناکانی بخاتە گەڕو ئایندەیەکی پرشنگدار دروست بکات، بەخەڵکیش بڵێت:

لـەدوڵی بەدوریـە لەئێـستاوە بـژی، ئەگـەر زینـدوبیت ژیانـت نـویێ بکـەرەوە، گـەر دڵتـەنگیت پەیوەنـدی بـەخوای گـەوەرەوە بکـە، بـاخوایش لەگـەڵت بێت، بەپێداگری‌و ورەو تینەوە.

کاتێك دیمانەم لەگەڵدا سازکرد لەبەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدابەناوی:

چاوپێکەوتن لەگەڵ کەسایەتیەکی سەرکەوتودا:

سەرسـامی کـردم بـزەو خەنـدەکانی سـەرلێوی، خەونـە قەشـەنگەکانی، هێـزی بـڕوا بەخۆبونەکـەی، خـوێن گەرمیەکـەی، داواملێکـرد بەشـێك لـەقورئانی پـیرۆزم بۆبخوێنێـت، دەنگێکـی بێوێنـە تەنانـەت مـن کـۆنترۆڵی خـۆمم بۆنـەدەکرا، دەسـتم کـردە گریـان لەترسـی خـوای پـەروەدگار، دوای ئـەوە داوام لێکـرد هەنـدێك لەسـرودە ئاینیـەکانم بـۆ بخوێنێـت زۆر بەشێوازێکی بێوێنە ئەوانیشی بەووشەی پڕمانا کرد.

ئێستا :

چی لەبارەی تۆی خوێنەرەوە بڵێین؟

ئایـا کـاتی ئـەوە نـەهاتوە هەڵوێـستەیەك بکـەیت‌و گـەردو غوبـاری ڕابـردو لەخۆت بتەکێنیت، دەست بکەیت بەبەدیهێنانی ئامانجەکانت؟!

ئایا کاتی ئەوە نەهاتوەدێوەزمەکەی ناخت بەئاگا بێنیت؟!

ئایا کاتی ئەوە نەهاتوەچێژ لەهەموو ساتەکانی ژیانت وەرگریت؟!

ئایا کاتی ئەوە نەهاتوەجێ پەنجەی خۆت لەدنیادا دیاری بکەیت؟!

دیـارە کـاتی ئـەوە هـاتوە ببزوێیـت، ببـزوە، خـۆت فێـری زمانـەکان بکـە، زمـان واتـا مـرۆڤ، خـۆت فێـری کۆمپیوتـەر بکـە، ئـەوە تـەکنۆلۆژیای سەردەمە.

کەواتـە پـەیبردنت بـە بـەتواناکانی خـۆت، دوای ئـەوە خۆپەسـەندی، پاشـان دەرکردنـی بڕیـار هەرئێـستا لەگـەڵ منـدا بڕیـار بـدە، ووشـەی بڕیـار لەئیغریقیـەوە هـاتوە واتـا یـەکلایی، واتـا بڕیـارێکی یـەکلایی نـەك بڕیـارێکی لاواز..

گـەر دەتـەوێت لەکێـشی خـۆت دابـەزێنیت، بـۆ لەئێـستاوە بڕیـار نادەیـت؟!

بـەخۆت بڵـێ، پێویـستە کێـشی خـۆم کـەم بکەمـەوە، ئـەوەی لەکێـشی خـۆی کەمکردۆتەوە لەهیچ شتێکدا لەمن باشتر نیە.

هـەروەها کـەباس لەجگەرەکێـشان دەکـەین کـەخراپترین دیـاردەی دزێـوە، گـەر سـەرنجێکی لایـەنی ڕۆحـانی بـدەین دەبیـنین لـەڕوە شـەرعیەکەیەوە حەرامـە، گـەر لەهـەر ولاتێـك بیـت لەزانایـەکی لەخواترسـی ئـاینی پرسـیار بکـە، دەبینیـت هەرچـی زیـانی بـۆ بـیرو هۆشـو جەسـتە هـەبێت حەرامـە، بەدەسـتی خـۆت بۆچـی خـۆت ئەخەیتـە گێـژاو، چـونکە هـەموو شـتێك لەڕۆژی دواییدا گەواهیت لەسەر ئەدەن.

گەرلەلایـەنی دەرونیـەوە سـەرنجی بـدەین، ئەوکەسـەی جگـەرە دەکێـشێت ئـازاری دەرونـی خـۆی ئـەدات، پاشـان نرخاندنـە خودیەکـەی لاواز دەبێـت، گـەرمرۆڤ ژیـر بێـت ئـەوا ئـازاری دەرونـی خـۆی نـادات، چـونکە دەزانێـت زیـانێکی بەتەندروسـتی خـۆی گەیانـدوە، دوچـاری نەخۆشـی بیروچـونەوەت دەکـات، هـەروەها گورچـیلەکان سـست ئـەکات، دەبێتـە هـۆی ٢٢جـۆر لەنەخۆشـی شـێرپەنجە، هـەوها لاوازی سێکـسی لـەپیاودا، ئەمانـە هـەمووی لەبـەر کەسـێکی جگـەرەکێش، هـەموو جگەرەکێـشێك دەڵێـت: مـن چـێژی لێـوەردەگرم، بـەڵام ئـەم ئەنجامـە نـاخوازم، ئەمـە کارەسـاتە، کـەپێی

دەوترێت: بەهۆی ئەم کارەساتەوە دەچیتە ئاگر، پێت دەڵێت ئەمە مەکروهەو حەرام نییە، کەچی لەڕاستیدا حەرامێکی تەواوە.

بۆیە پەیبردن سەرەتای گۆڕانە، گەربتەوێت واز لەجگەرەکێشان بێنیت دیارە دەرکت بەزیانەکانو مەترسیەکانی کردوە، ئاسۆت فراوان دەکەیت، هێزو تواناکانت بەکاردەبەیت بۆ پاراستنی جەستەو تەندروستیت، چونکە بەناتەندروست بوون هیچت بۆناکرێت، دوای ئەوە دڵخۆش نابیت، سەرنجێك بدە دەبینیت زۆرینەی هونەرمەندە مەزنەکان مردوون بەهۆی جگەرەکێشانو مەیخۆری، هەروەها زۆربەیان نیگەرانن، بۆچی؟ بۆئەوەی پەی بەتواناکانیان نابەن پەی بەوە نابەن خوای گەورە چاودێریانە.

پەیبردن سەرەتای گۆڕانکاریە، کاتێ پەیت برد بەتوانا بێسنورەکانی خۆت، خۆت پێ پەسەند بوو بەتەواوی، لەئێستاوە بڕیارێکی یەکلایی کەرەوەتدا کەتواناکانت بەکاربێنیت بەئاسودەیی بژیت، ئەوە بڕیاری یەکلایی کەرەوەیە.

ئافرەتێك بەناوی( جوان) لای خۆم بەڕێوەبەری بازاڕبوو لەمۆنتریال، هەرکات هەرکەسێك لێی دەپرسی: چۆنیت؟ وەڵامێکی سەیری ئەدایەوە دەیوت: زۆرباشم، کەس ناتوانێت ئەمە بگۆڕێت کەلێی دەپرسرا، بۆ وادەڵێیت؟ دەیوت: بەباشی هاتووم، بەباشی ئەگەڕێمەوە، بەباشی بەردەوام ئەبم، لەسەرشەقامدا باشم، هەرچیم پێ بڵێن هەرباشم، ئەنجامەکانی ئەو ئافرەتە بەرزترین ئامانجێك بوون کەمن لەژیانمدا دیبێتم. بەڕێوەبەرێکی بێوێنە، لەوپەری زیرەکیدا، لەهەموو هاتوچۆیەکیدا هەمیشە نوێو تەواو وەکو ڕاوچی ماسی!

دووکەس خەریکی ڕاوە ماسی بوون، یەکێکیان ماسی دەگرت و ئەویتریان بۆی نەدەگیرا، ئەوەی بۆی نەدەگیرا شاتوی دەکرد بەقولاپەکەیەوە، ئەویتریان کرمی دەکرد بەقولاپەکەیەوە، ئەوی بۆی نەدەگیرا بەویتریانی وت: تۆچۆن دەیانگریت؟ وتی کرم دەکەم بەقولاپەکەمەوە. وتی: بۆچی؟ وتی: چونکە ماسی حەزی لەکرمە، ئەمیش لێی پرسی ئەی تۆ چی دەکەیت بەقولاپەکەتەوە؟ وتی: شاتو.
پێی وت بۆچی؟ وتی: چونکە خۆم حەزم لەشاتوە.
وتی: ئەمرۆ هەرگیز تامی ماسی ناکەیت، چونکە دەبێت بەحەزی ماسیەکان ڕاو بکەیت نەك بەحەزی خۆت.
بەوشێوەیەش دەبێت ئەوەبدەیتە خەڵکی کەدەیانەوێت نەك ئەوەی تۆ ئەتەوێت، وەك ئەو کچە بەپێی خواستی خەڵکی هەڵسوکەوتی ئەکرد، چونکە پەی بەپێویستیەکانی خەڵکی بردبوو، بەسیستمێکی ئێکجار ڕێکو پێك کاری دەکرد، بەهەموو کەسێکی ئەوت زۆرباشم، کەسیش توانای گۆڕینی ئەو حاڵەی نییە، من زۆرباشم سوپاس بۆ خوا، چونکە خوای گەورە بەجوانی بەدیهێناووم، بەجوانترین شێواز ئەفراندومی، دەبێت ئەوە بزانم، من بەسەر زەویدا ڕێدەکەم بەبێ لوتبەرزی، بێگومان هاوکاری زۆرینەی خەڵکیش ئەکەم.
ئێستا جارێکی دیکە دوبارەی دەکەمەوە یەکەمین شتێك پەیبردنە بەتوانا بێسنورەکانت، خۆپێپەسەند بونتە، پاشان بڕیاری یەکلایی کەرەوە بەبەکاربردنی تواناکانی ئێستات، کاتەکانت بەفیڕۆ مەدە لەقسەی بێهودەدا، کاتەکانت بەفێرۆمەدە لەوسێ دەردە کوشندەیە لۆمەکردن، ڕەخنە گرتن، بەراوردکردن.. هەرچەند زیاتر بەکاریان ببەیت

زیاتر زاڵدەبن بەسەرتدا کاتەکانت لەکیس ئەدەن، کاتەکانت لەبری ئەوەی لەلۆمەدا خەرج بکەیت لەکارێکدا خەرجی بکە، لەبری ئەوەی لەبەراوردکردنێکدا خەرجی بکەیت خۆت بگۆڕە بەکەسێکی باش‌و چاك، لەبری ئەوەی لەڕەخنەگرتندا کاتەکانت خەرج بکەیت خەڵکی پەسەند بکەوەك ئەوەی کەهەن، هەوڵبدە ئاکارت بگۆڕیت.

دوای ئەمانە هەڵبژاردن دێتە کایەوە.

ئایا حەزدەکەیت بەکامەرانی بژیت یان بەنیگەرانی؟

لەخۆت‌و خەڵکی بپرسە، کەس نابینیت پێت بڵێت: حەز بکات بەنیگەرانیەوە بژی، یان حەز لەنەخۆشی و نەخۆشخانە بکات، هەموو کەسێك حەز لەکامەرانی‌و بەختەوەری ئەکات.

دوای ئەوە باپرسیاری دووەمت لێبکەم:

ئایا بەڕاستی دەسبەکاربویت بۆ گەیشتن بەبەختەوەری؟

گەرکەسێك پێت بڵێت: من حەزدەکەم بچمە بەهەشت، لێی بپرسە.

بەڕاستی خۆتت بۆ بەهەشت ئامادە کردووە؟

گەر جگەرەکێش بێت، یان فێڵ لەخەڵکی بکات، یان درۆزن بێت، یان زینا بکات، ئەمانە هەموویان بەرەو ئاگری دەبەن.

مادام خەریکی ئەم ڕەفتارانە بیت ناگەیتە ئەوەی ئەتەوێت بۆیە توشی نیگەرانی ئەبیت، چونکە ئەمانە پێچەوانەی دەرونیینن، بۆیە کەبیر لەشتێك دەکەیتەوە تۆ ئەخوازیت‌و هەڵتبژاردوە بەڕاستی، کاتێ هەڵتبژارد دەبخەیتە ئاستی کردارەوە، چونکە ئەوە هەڵبژاردنە، بڕیاریش هەڵبژاردنی پێویستە، بۆنمونە تۆ ئەتەوێت دانیشیت قاچ بخەیتە سەر قاچ، بڕیارەکە بەر لەهەڵبژاردنەکە دێت، گەر ویستت

بەشێوازێکی نادروست دانیشیت، کاردەکاتە سەر لادیسکەکانی کەمەرت، ئەوکات دیکەیتە هەراو دەڵێیت من بەدبەختم، کەچی خودی خۆیشت بڕیارەکەت دەرکردوە ئەوەت هەڵبژاردوە بەوشێوازە دانیشیت، هەموو مرۆڤێك بڕیار ئەداتو هەڵدەبژێرێت، ئەوشێوازەی پێی دانیشتویت خۆت بۆخۆتت هەڵبژارد.

تۆ بڕیارتداو ئەوەت هەڵبژارد گوێ بۆمن بگریت، تۆ بڕیارتداو هەڵتبژارد کەکتێبەکەم بخوێنیتەوە، هەروەها تۆ بڕیارتداو هەڵتبژارد کەتوڕەبیت، هەروەها بنویت، هەروەها چارەنوسی خۆت دیاری بکەیت، تەنانەت خۆتت پێ پەسەند بێت هەروەها پەی بەتوانا بێسنورەکانت ببەیت.

هەروەها...

پەیبردن..پێ پەسەند بوون..بڕیار..هەڵبژاردن...

ئایا ئەمانە بەسن بۆ بەئاگا هێنانەوەی تواناکانمان؟! هەرگیز.

دوای ئەوانە بەرپرسیارێتی دێتە گۆڕێ، چونکە چونەژێرباری بەرپرسێتی سەرەتای هێزی خودیە.

ڕۆژێك لەڕۆژان بەڕێوەبەری گشتی یەکێك لەشوێنەکانی مۆنتریال بووم، زیاتر لە٢٠٠٠ کارمەندم لەبەردەستدا بوو، من بیرۆکەی نوێم دائەڕشت بەڵام کاروبار بەدڵی من نەبوو، لەناو ئۆتۆمبێلەکەمدا بووم بەخۆمم وت: ئەمانە بۆچی لەمن تێناگەن؟

نەبێت ئەوانە دەربکەم کەگوێ بۆقسە ناگرن، لەوکاتەدا گوێم لێبوو کەسێکی بەهێزی بواری گەشەی مرۆیی جیهانی وەك لەگەڵ منی بێت دەیوت: نەباوکت نەدایکت نەخوشك‌و نەبراکانت نەبەڕێوەبەر هیچیان بەرپرسی بیرو هەستەکانی تۆ نین، تۆخۆتیت بەرپرسیارێتی ژیانت

لەئەستۆدایە، ئەم قسانە وەکو ئاوێکی سارد ڕژانە سەر ئەقڵو جەستەم، هەربەڕاستی سەیرێکی خۆمم کرد لەئاوێنەکەدا ببینیم هۆکارەکەی تەنها خودی خۆمە، خەڵك نییە، ئەوە من ناتوانم خەڵکی تێگەیەنم، من کاتێکم بۆداناوون توانایان بەسەریدا ناشکێت، من بیرۆکەیەکم بۆ داناوون ئەوان لەسەری ڕانەهاتوون، کەچی هێشتا گلەییان لێدەکەم، سەرەنجام دەبێت بچمە ژێرباری بەرپرسێتی ژیانمەوە.

ئەو منداڵەی دێتە دنیاوە، خۆی مەمکی دایکی دەمژێت، فێری چۆنیەتی مژین دەبێت، کاتێ دایکی فێرە ڕۆشتنی دەکات، تەنها خۆیەتی هەڵدەسێت بەکردنی جوڵەی یەکەمجاری، هەرلەوکاتەوەی خوای گەورە دەمانخوڵقێنێت بەجۆرێك لەخۆمان بەرپرسبین.

پاشایەك دەیوست بزانێت خەڵکەکەی بەرپرسن لەخۆیان یان نا، فەرمانیدا بەپاسەوانەکانی تاشە بەردێکی گەورە بخەنە سەر ڕێگەیەك، بۆئەوەی بزانێت خەڵکی چۆن ڕەفتار دەکەن، تاشەبەردەکە زۆر قورس بو کەس بەتەنها نەیدەتوانی بیجوڵێنێت، کەسی یەکەم هاتو لەئۆتۆمبێلەکەی دابەزیو دەستی کردە جنێودانی پاشاو وڵاتو خەڵکی، پاشان دووەم هاتو هەوڵیدا لایبەرێت نەیتوانی ئەویش دەستیکردە جنێودانی پاشاو خەڵکی، ئەنجا سێیەمیش هات لەئۆتۆمبێلەکەی دابەزی هەوڵیدا لایبەرێت نەیتوانی، ئەمیان بیری کردەوە ئەمە چۆن لەسەر ڕێگەی خەڵکی لابەرێت، هەوڵیدا بەپارچە تەختەیەك بیجوڵێنێت بەڵام تەختەکەی شکا، خەڵکی کۆکردەوە کۆمەکی بکەن، هاتن بەدەمیەوە هاوکاریان کردو توانیان تاشەبەردەکە

لەڕێگەکە دووربخەنەوە، لەبن دارێکەوە کەسێك بەچەکێکی بانکەوە خۆی لێ ئاشکرا کرد، کابرا سەیرێکی چەکەکەی کرد نوسرابوو ٢ملیۆن دۆلار، کابرا پێی وتت تۆ پاشایت؟

پاشا وتی: بەڵێ من پاشام، کابرا وتی: لێرە چی ئەکەیت؟

وتی: من ئەو تاشە بەردەم لەوسەر ڕێگەیە دانا بۆئەوەی بزانم کێ دەچێتە ژێر بەرپرسیارێتی ئازاری خەڵکیەوە ٢ملیۆن دۆلاریشم کردۆتە خەڵاتی ئەو کەسە، بۆیە تۆچویتە ژێر ئەوبارەو ئەمەش شایانی تۆیە.

ئەمەش تەنها بە٢ملیۆن دۆلار تەواونابێت، بوڵکو ئەمەیە مادام دەچیتە ژێرباری ئەو بەرپرسیارێتیەوە ئەم خەڵاتە دەبێتە سەرەنجامت، تۆ پەیت بەتواناکانت برد، خۆتت پێ پەسەند بوو، بڕیارتداو هەڵیبژارد، چویتە ژێر بەرپرسێتیەوە، بەمجۆرە بەردەوامبونت لەگەڵ ئەمو ئەودا بەشێوازێکی یەك لەدوا یەك هاوسەنگو ساغ.

**یەکەمین پەیبردن بەتوانا بێسنورەکان، دوای ئەوە خۆپێپەسەند بوون، دوای ئەوە بڕیار بەبەکاربردنی ئەم توانا بێسنورانە، پاشان هەڵبژاردنی ڕەفتارێکی گونجاو بۆجێبەجێ کردن، دوایی چونە ژێرباری بەرپرسێتی دوای ئەمانە پاککردنەوەی ڕابردوو..**

کەس هەیە ڕابردوی پاك بکاتەوە؟

بێگومان، بەڵێ..ئێستا من پرسیارێکت لێدەکەم: ئاڕوداوێکی ناخۆشت بەسەرهاتوە لەڕابردودا؟

بێگومـان، بـەڵێ..هەریـەکێك لەئێمـە ڕوداوێکـی ناخۆشـی هەیـە، پرسـیارێکی ترت لێدەکەم:

گـەر بگەڕێیتـەوە بـۆدواوە هـەمان کارەسـاتت بەسـەر بێتـەوە، ئایـا هـەمان هەڵوێـستت ئـەبێت؟ بێگومـان .. نـەخێر، بۆچـی؟ گەربکەویتـە هـەمان هەڵوێـستەوە لەئێـستادا دیـارە بەشـێوازێکی باشـتر لەگەڵیـدا دەجوڵێیتـەوە، گـەر بکەویتـەوە هـەمان هەڵوێـست بەشـێوازێکی هەڵـە لەگەڵیـدا بجوڵێیتـەوە ئەوکاتـە لۆمـەی خـۆت ئەکـەیت ڕەخنـەی لێـدەگریتو بـەراوردی ئەکـەیتو دڵتـەنگ دەبیـت، بـەلام هـەر کەگەڕایتـەوە بـۆدواوە بۆهـەمان هەڵوێـست بەشـێوازێکی جیـاواز مامەڵـەی لەگـەڵ بکـەیت ئەوکاتـە دەبینیـت ڕابـردو گـۆڕا بـۆ پەنـد لێـوەرگرتن، بێگومـان گەڕاویتـەوە بۆئـەزمونێکی تـاڵ لـەڕابردوتا بەرسـەرت هـاتووە. بەزەینتـدا بـچۆرەوە بـۆ ئـەوێ، زەینـت توانـای گەڕانـەوەی هەیـە بـەرەو دواوە ئـەزمونی سـاتەکان بژیەنـــەرەوە، ئەمانـــە دەبینیتـــەوە: بیرکردنـــەوەت، ..چـــۆنیەتی بیرکردنـەوەت، دۆخـی جەسـتەیت، چـۆن وەسـتابویت، چـۆن دانیـشتبویت، دەربڕینـــەکانی ڕوخـــسارت، دەربڕینـــەکانی ڕوخـــسارت چـــۆن بـــوون؟ هەناسـەکانت، ڕەفتارەکانـت، چـیت دەکـرد؟ هەسـتەکانت، هەسـتت بەچـی دەکرد.

ئێـستا واز لـەم ئەزمونـە تاڵەبێنـە، هەناسـەیەکی قـووڵ هەڵمـژە، پاشـان بەهێواشـی بیـدەرەوە، سـەیرێکی ڕاسـتو چەپی خـۆت بکـە، ئەمـە پێی دەوترێ شکاندنی دۆخ.

پێغەمبـەر(ص) دەفـەرموێت:إذا غـضب أحـدكم وهـو قـائم فلـيجلس، فـإن ذهب عنه الغضب وإلا فليضطجع

واتــە: گــەر کەســێك تــورە بــوو بــەپێوە بــوو بادانیــشێت، تاتورەییەکــەی نامێنێت، ئەگینا باپاڵکەوێت...

ئێستا لــەخۆت بپرســە: لــەم ئەزمونــەوە چیت وەرگــرت؟ گــەرجارێکی دیکــە بگەڕێیتــەوە بــۆدواوە چــۆن ڕەفتــار دەکــەیت؟ پێــنج شــت بنوســە کەلــەم ئەزمونــەوە فێــر بویــت، گــەر جــارێکی دیکــە گەڕایتــەوە جەســتەت چــۆن دەبێــت، چ دەربڕینێــك لەڕوخــسارتدا دەبێــت، بــەچ شــێوازێك هەناســە ئــەدەیت، چــۆن دەبزوێیــت، بیرلەچــی دەکەیتــەوە، چ ڕەفتارێــك دەخەیتــە گەڕ؟

ئایــا هــەموویت نوســی؟ لەگــەڵ منــدا بگــەڕێوە بــۆ دواوە ڕەفتــار بکەبــەپێی ئــەو ســتراتیژە نوێیــە، ســەرنج بــدە بزانــە چــی ڕودەدات، دەبینیــت بەشــێوازێکی باشــتر دەجولێیتــەوە، دۆخــی جەســتەیت باشــتر بــوە، دەربڕینــەکانی ڕوخــسارت باشــتر بــوە، جوڵــەکانت بیرکردنــەوەکانت ڕەفتارەکانــت ســەرجەمیان باشــتر بــوون، ئــەزانی بۆچــی؟ چــونکە لەڕوداوەکــەوە فێــر بویــت، مــادام تۆبــەو چاکیە فێــر دەبیــت، ئــەو فێربونــەش بەکار دەبەیت، چیتر شتەناقۆلاکان خۆیان بزر دەکەن.

بۆیە (کاڵ یوننج) بەپێشەوای دەروونناسی هەژمار دەکرێت دەڵێت:

واز لەهەستە سلبیەکان بێنە شارەزایی بەکار بێنە.

ئــەم دودەســتەواژەیە زۆر بــەهێزن، چــۆن لەهەســتە ســلبیەکان بــەدور بــین، شــارەزایی بــەکار بێــنین، بەبــەکار بردنــی شــارەزایی هەســتی ئیجــابی دەکــەین، بــەلاّم نابێــت دوو هەســتت هــەبێت، یــان هەســتی ســلبی، یــان ئیجــابی، کاتــێ شــارەزایی بخەینــە گــەڕ بــیر لەهــەمان ئــەزمون بکەینــەوە

دەبینین هەستی سلبی خۆی دەشارێتەوە هەستی ئیجابی خۆی دەنوێنێت. بەمشێوازەش دەتوانی ڕابردوو پاك بكەیتەوە.
كاتێ بیر لەئەزمونێكی تاڵ دەكەیتەوە، بزانە چیت كردوە، چۆن هەڵسوكەوتت كردوە، جارێكیتر پیایدا بچۆرەوە، بەلام بەوزانیاریەی فێری بویت، مامەڵەیەك وابزانە یەكەمجارتە ڕوبەڕوی ئەو كێشەیە دەبیتەوە، دەبینیت بەشێوازێكی نوێ مامەڵە دەكەیت، ئەمەش پاككردنەوەی ڕابردووە.

یەكەمین شت پەیبردنە، پاشان خۆ پێپەسەند بون، پاشان بڕیار، دوای ئەوە چونە ژێرباری بەرپرسیتی، دوای ئەمانە پاككردنەوەی ڕابردوو.

ئێستا ڕێكخستی هەنوكەیی: دوای ئەوەی ڕابردومان پاكردەوە، دەبێت ڕێكخستن لەئێستادا بكەین.
دوای ئەوەی ڕابردومان پاك كردەوە، دەبێت ئێستا ڕێك بخەین، چۆن ڕیكخستن لەئێستادا بكەین؟ ڕیكخستنی بەهاو یەكەمایەتیەكان،، پاكردنەوەی چواردەوری ماڵ.
جارێكیان لەمۆنتریالدا، ئافرەتێك هات بۆلام تەمەنی لەسییەكان تێپەڕی كردبوو، زۆر دڵتەنگ بوو، بیری لەتەلاق دەكردەوە، پێی وتم: دكتۆر، چی بكەم لەم حاڵەناڵەبارە ڕزگارم بێت؟
وتم: چەن شتێكت لێداوا دەكەم ئەنجامیان بدە. گەر ئەنجامیان نەدەیت، ئەوا جارێكی دیكەسەردانی من مەكەرەوە.
وتی: چی بكەم؟

کاسێتێکم پێداو پێم وت: بەئۆتۆمبێلەکەت بچۆ بۆ بنکەی پاکردنەوەی ئۆتۆمبێل جوان دەرەوەو ناوەوەی بشۆ، دوای ئەوەی پاکت کردەوە پەیوەندیم پێوە بکە، پاشان کاسێتەکەبخە سەرو، ئەنجا بەدەم ڕێگەوە بڕۆ بۆ دوکانێکی گوڵ فرۆشتن چەپکێك گوڵ بکڕەو پاشان پەیوەندیەکی ترم پێوە بکە، هەنگاو بەهەنگاو لەگەڵیدا بووم، کاتێ چەپکەگوڵەکەی کڕی پەیوەندی پێوە کردم، وتی دوای ئەمە چیتر بکەم؟

وتم: هەرکەگەشتیتە ماڵەوە پەیوەندیم پێوە بکەرەوە، پاشان وتی چی بکەم؟

وتم: گوڵەکان لەو ژورەدا دابنێ کەدەتەوێت ڕوناك بێت، گوڵەکانی لەمۆڵەکەدا دانا، حەزینەدەکرد مۆڵەکە پیس بێت پاکی کردەوە، پەنجەرەکانی کردەوە، مرۆڤ کاتێ پاکو خاوێن بێت بیرکردنەوەشی فراوان دەبێت، کاتێ مۆڵەکەی پاککردەوە، ژوری نوستنەکەشی پاك کردەوە تاوایلێهات هەموو ماڵەکەی پاك کردەوە، ئەنجا وتی: دکتۆر، من هەستێکی نائاسایم هەیە، گوڵەکان هەموو ژیانمیان ڕەنگالەیی کردووە، پاشان وتی: جارێکیتر قسەت لەگەڵ ئەکەمەوە چونکە وا مێردەکەم هاتەوە.

کاتێ مێردەکەی هاتە ژورەوە وایزانی بەهەڵەدا چووە، خەریك بوو بچێتە دەرەوە، ژنەکەی ماڵەکەی پاك کردۆتەوە، گرنگی بەخۆی داوە، جلی جوانی لەبەرکردوە، مێردەکەی وتی: کاتێ زەماوەندمان کرد کتو مت وەکو ئێستا وابوو، بەڵام بیرمان چۆتەوە، من زۆر سوپاست

ئەکەم،چونکە خۆتت ماندوو کردوە، ئەویش چویە گەرماوەوە خۆی شۆرد هەمانشێوە ئەویش خۆی گۆڕی.

ئەمجارەیان پێی وتمەوە: من لەوپەڕی دڵخۆشیدام، دوای ئەوە چی بکەم؟

وتم: یەکەمین شت ئەوەیە چوارچێوەی بیرکردنەوەکانت پاك بکەرەوە، وەك ئەوەی ناوی ئۆتۆمبێلەکەت پاك کردەوە پاشان بیرت لەدەرەوەی کردەوەو ئەویشت پاککردەوە، دوای ئەوە سەرنجێکی خۆت بدە، کاتێ گوێت بۆکاسێتە گرت گوێت لەچەن وتەیەکی بەهێز بوو، پارمەتیدات وزەی ناوەکیت بخەیتە گەڕ، کاتێ ناوەوەو دەرەوەی ئۆتۆمبێلەکەت پاککردەوە، گەر کەسێك لێی نزیك بێتەوە بیەوێت پیسی بکاتەوە ئەوکات جنێوی پێئەدەیت، چونکە ئەتەوێ بەپاکی بمێنێتەوە، ژیانت بەرەنگی رەش‌و سپی بوو بەلەوەی گوڵەکان بکرێت دوای ئەوەی کرێت گۆڕا بۆ رەنگەکان، بۆیە بیرکردنەوەکانیشت گۆڕان، چونکە مرۆڤ کەبیر لەوێنەیەك ئەکاتەوە توانای بیرکردنەوەی رەنگەکانی هەیە، کاتێ داوام لێکردیت لەخۆشترین شوێنی ماڵەکەدا دایبنێیت، تۆیش لەهۆڵەکەدا داتنا، بۆئەوەی لەهەر شوێنێکی ماڵەکەدا بیت بتوانیت چاوت پێی بکەوێت، چونکە کاتێ مرۆڤ خۆی پاککردەوە، دەیەوێ لەباشترین قۆناغی ژیانیدا بێت، بۆیە هەستایت بەپاککردنەوەی ماڵەکەو نەتدەویست هیچ شوێنێکی بەپیسی بمێنێتەوە، بەتایبەت لەناخەوە تۆ خۆتت پاککردبویەوە، پاشان خۆتت بەجوانترین شێوە گۆڕی لەناخەوە وێنە ناوەکیەکەت پاکو بێگەرد کردبوو، بۆیە پاکی دەرەوەو ناوەوە وایلێکردیت هەستت بەرەزامەندی‌و دڵخۆشی کرد، کاتێکیش مێردەکەت

هاتــەوە ئــەم حاڵــەی بینــی بــڕوای نــەدەکرد و حەزینــەدەکرد بەپیــسی بێتــە نــاو ئــەو پــاکی‌و بێگەردیــەوە بۆیــە ئــەویش هەونــشێوە خــۆی شــۆرد، ئــەم پــاك کردنــەوەی چوارچــێوەیەی خۆمــان لــەدەرەوە کــاریکردە ســەر پــاکی ناخمان.

بۆیــە خــوای گــەورەش دەفــەرموێت: إن الله لايغـير مـا بقـوم حتـى يغـيروا مـا بأنفسهم

یەکــەمجار پێویــستە خــەڵکی خۆیــان پــاك بکەنــەوە، بیرکردنــەوەکانیان پــاك بکەنــەوە، چــونکە بیرەنــد بیرکردنەوەکــە لەزەینیدایــە، بیرۆکــەش هۆکــاری بیرکردنەوەیــە، تــەرکیز هۆکــاری ئاگاداربونەوەیــە، ئاگاداربونــەوە هۆکــاری هەســتەکانە، هەســتەکان هۆکــاری ڕەفتارەکانــە، ڕەفتارەکــانیش هۆکــاری دەرەنجامــە، دەرەنجــامیش هۆکــاری دروســتکردنی چارەنوســە، گــەر بتــەوێ چارەنوســت بگۆڕیــت، بگــەڕێوە بیرکردنــەوەکانت بگــۆڕە، گــەر ویــستت گۆڕانکــاری بێنیــت بەســەر ژیانتــدا ئــەوا لەپاککردنــەوەی خۆتــەوە دەســـت پێبکـــە لەناخـــەوە، دەرونـــاوی خـــۆت ڕێـــك بخـــە، کاتـــێ بیرکردنــەوەکانت ڕێکخــست یەکــەمجار لــەخۆت بپرســە: یەکەمایەتیــەکانت چــین؟ چــی لەهــەموو شــتێك گــرنگترەو شــایانی گۆڕینــە، بیرکردنــەوەکانت ڕێــك بخــە، یەکەمایەتیــەکانت ڕێــك بخــە، پێنــوس و پەڕەیــەك ئامــادە بکــە، بیرکردنـــەوەکانت، کـــارە یەکەمایەتیـــەکانت بـــەڕێکی بنوســـە پاشـــان سەرنجێك بدە بزانە هەست بەچی دەکەیت.

بزانــە دەرکــت بــەتوانا بێــسنورەکانی خــۆت کــردووە، خۆتــت بەتــەواوی پــێ پەســەندە، هەڵبــژاردنت کــردووە، چــویتە ژێربــاری بەرپرســێتیەوە، ڕابــردوت پاککردۆتـــەوە، ئـــەوەی بتوانـــێ بتگێڕێتـــەوە بـــۆ دولوە ڕابـــردوە(داتـــا)ی

سلبیە دەبێت لێیانەوە فێربیت بیانگۆڕیت بۆ شارەزایی، کاتێ مێشك بیرلەڕابردو ئەکاتەوە خولێکی زەینی پێچ ئەخوات دەگەڕێتەوە بۆ دواوە، دۆسیەیەك دەکاتەوە بۆ بەکاربردنی لەگەڵ جیهانەکەی دەرەوەو ناوەوە، پاشان هیچ شتێك ڕێگر نییە، دوای ئەمانە دەتوانم چی بکەم؟ من لەم ساتەدا ئەژیم بەهەموو مانایەکیەوە، بیرکردنەوەم ڕێکدەکەم، یەکەمایەتیەکانم ڕێکدەخەم، لێرەوە ئەتوانم ئایندەی خۆم دروست بکەم، قۆناغی دوای ئەمە ڕاستەوخۆ ئامادەیی تەواوە، وەرزشەوانێك کەدەچێتە هەر پاڵەوانێتیەکەوە دەبێت لەناوەوەو لەدەرەوە ئامادەبێت، ڕاهێنانی چاکی کردبێت، وەك دەزانن من خۆم پاڵەوانی میسر بووم لەیاری تێنسدا ئەمە کارێکی هەروا ئاسان نییە، ڕۆژانە ٦- ١٠ کاتژێر مەشقم دەکرد، بیرمدەکردەوە چیم دەوێت، ئەوەی دەمویست هەڵسەنگاندنم بۆ دەکرد، پاشان وزەی جەستەیم هەڵدەسەنگاند، لانیکەم میلێکم دەبڕی، پاشان ڕاهێنانی سەر مێزم بەخۆم دەکرد بەهەموو بارودۆخە پێویستەکانیەوە.

ئەمەش واتا هەر پاڵەوانێك دەبێت بیرو هۆش و جەستەی ڕابێنێت، مەشق لەسەر هەموولایەنەکانی یارییەکەبکات، پزیشکێکی برین پێچ دەبێت ئامادەیی ئەوەی هەبێت، ئەندازیارێك خانویەك دروست ئەکات دەبێت ڕاهاتبێت لەسەر ڕەگو ڕیشەی بناغەی خانوەکە، ئافرەتێکی دوگیان ئەبێت ئامادەیی کاتی منداڵ بونی هەبێت، هەموو جەستەو بیرو هۆش و تەندروستی ئامادەکردبێت، بۆ ئەوەی منداڵێکی ساغ بێنێتە دنیای بوون، ئەمەش مانای هەریەکێك لەئێمە دەبێت لەناخەوە خۆی پڕ چەك کردبێت، ئامادەیی هەبێت بۆملململانێی ژیان،

کاتێ پێت دەڵێم: پەیبردنت بۆ ژیانێکی خۆش، خۆتت سەرانسەر پێ پەسەند بێت، تۆ بڕیار بدە ئەم تواناییانە بەکار ببەیت، ئەمە سەرەتایە، ئەو ڕەفتارەی دەتەوێت هەڵیبژێرە، ئێستا تۆ لەناوەوەی، دوای ئەمە بچۆرە ژێرباری بەرپرسیێتیەکی تەواو، لۆمەی خۆت مەکە، هەرچیت بەسەر بێت تۆخۆتت پاککردۆتەوە، ڕێگەی چارەنوست لەبەر گرتوەدوای ئەمانە دەبێت رابردوت پاک کردبێتەوە یەکەمایەتیەکانت ڕێك خستبێت و گرنگیت پێدابن.

ئایا ئەمانە بەسن بۆ دروستکردنی ئایندەت؟

نەخێر... ئەمانە بەس نین، چونکە دەبێت ئامادەبیت بۆ ئایندە، کاتێ دەتەوێ دەسبەکاربیت ئاستەنگەکان دێنە ڕێت، دەبێت ئامادە بیت، بزانیت پشتت بەخوا بەستوە، دەرنجامەکان لەدەستی پەروەردگاردان، کاتێ لەدەرەنجامەکان چرپویتەوە، ئەوکاتە باس لەبابەتەکە دەکەیت،" ئایندە دروست بکە" لێرەدا بەدرێژی لێی دەدوێین:

دنیا بینی:

ئیستا دنیا بینی مانای چیە؟ مەبەست.. مانای چیە؟ ئامانج ..مانای چیە؟ ڕێگەی ڕاست مانای چیە؟ گەشبین بن بەچاکە بادەستتان کەوێت مانای چیە؟..

فإذا عزمت فتوكل على الله... مانای چیە

يا أيها الذين آمنوا إستعينوا باصبر والصلاة إن الله مع الصابرين... مانای چیە...

گەر بەمشێوەیە بیربکەیتەوە دەبێت ئامادەبیت هەبێت، لەمیانەی ئامادەباشیەکاندا دەبێت ئامادەیی تەواوت هەبێت بۆ ئایندە. بیرتە

کاتــێ وتم مــن ئامــادەیی دەرونــیم هــەبوو کاتــێ وەرزشــم دەکــرد، ئێــستا وەرەو بائامادەبیــەکی زەینــی وەرگــرین، بۆئــەوەی بــەزەین ئامــادە بــین دەبێــت ئــەوەبزانین، ئــەوی خۆتــت بــۆ ئامــادە کــردوە هیــچی لــەبارەوە ئــەزانیت، یــان هــیچ شــارەزاییەکت لەبارەیــەوە هەیــە، پێویــستە بخوێنیتــەوە زیــاتر گەشــە بــەخۆت بــدەیت، ڕۆژانــە بیــست خولــەکێك خــەریکی خوێندنــەوە بیــت، لــەکۆڕو کۆبونەکانــدا ئامادەبیــت، خــۆت فێــر بکــەیت، گــەر ئۆتۆمبێلیــت هــەبێت گــوێ لەکاسێت بکریــت، گــەر چــەن زمــانێکیتر بزانیــت لــەبارەی زانــا بیانیەکانــەوە بخوێنــەوە، چــونکە ئــەوان لەوپــــەڕی هێــــزدان، ئۆتۆمبێلەکــــەت بکەبەزانکۆیــــەکی گــــەڕۆك، وەك "ئەنیــشتاین" دەڵێــت: زانــین هێــزە، هــەروەها دەڵێــت گــەر زانابیــت دەتوانیــت تەڵــەی مــشك دروســت بکــەیت لــەوەی هاوســێکانت باشــتربێت ئەوانیش دێن بۆلات بۆئەوەی وەك تۆ دروستی بکەن.

دوای ئــەوە دەبینیــت مــرۆڤ دانــاییو توانــای هەیــە دەتوانێــت خــۆی بناسێت، یــان لــەجیهانی دەرەوە وەریبگرێــت،، بــەڕای مــن دەبێــت دوڕێگــە بزانیــت، بەبــەردەوام بونــت قــاڵ دەبیــت لەشــارەزایدا، نــەرمو نیــانو لێزانبــە لەزانینــدا، چــونکە بەشــارەزاییت تواناکــان بــەئاگا دێــن، لەپەیبردنــەوە بــۆ خۆپەســەندبوون، بــۆ بڕیــار، بــۆ هەڵبــژاردن، بــۆ بەرپرســیارێتی، بــۆ پاککردنــەوەی ڕابــردوو، ڕکخــستنی ئێــستا، بــۆ ئامــادەیی تــەواو، تــەواو واتــا ئــەمڕۆ گــەر پــەرتوکێکم پێــدایت بیخوێنیتــەوە، پێنوســێکی ســەوزو ســور بگــرە دەســتت، نیــشانەی بکــە، بەخوێندنەوەیــەکی خێــرا بەکاتــژێرێك تــەواوی دەکــەیت، دوای ئــەوە بــۆ شــارەزایی تــەواو، گــرنگ نیــە بەکاتــژێرێك پەرتوکەکەتــەواو بکــەیت، ئــەم پەرتوکــە توێژینەوەیەکــە، پــەڕە پــەڕەی

دەکـەیت، بەپێنوسـە سـورەکە زانیاریـەکان نیـشانە دەکـەیت ئەوانـەی ئاسـۆت بـۆ والآ دەکـەن، لێـی فێردەبیـتو سـودمەند دەبیـت، کاتـێ زانیاریـە تایبەتیـەکانت لێـدەرکرد ئـەوکات شـارەزایی تـەواوت دەبێـت لـەبارەی پەرتوکەکەوە لەکۆتاییشدا خۆتت پرچەکی زانیاریەکان کردوە.

ئەوانـەی باسمـان لێـوەکردن هـەموویان هۆکـارن، ئێـستا بابـاس لەبەشـی ڕۆحانی بکەین:

ئـەویش "نیـاز" واتـە تـۆ مەبەسـتت ئەوەیـە تواناکانـت بخەیتەگـەڕ، نیـەتت ئەویـە هـەموو هەسـتەکانت بەکاربیـەیت، مەبەسـتت ئەوەیـە دەسـتی یارمـەتی بـۆ زۆرینـەی خـەڵکی درێـژ بکـەیت، نیـەتت ئەوەیـە هەرچیەك ڕوبـدات دەسـبەرداری ئامانجـەکانت نابیـت، مەبەسـتت ئەوەیـە پـشت بـەخوای بالآدەسـت ببەسـتیت، فـإذا عزمـت فتوکـل علـی الله إن الله یحـب المتوکلین

گـەر بمانـەوێ یـەك لـەدوای یـەك وەریـانگرین، بەمـەرجێك، گـەر بڕیـار بـدەیت، هەڵبـژێریت، بەرگـەی بەرپرسـیارێتی بگریـت، بڕیاربـدەیت هەسـتەکانت بـەکار ببـەیت، هـەموو هۆکارەکـان بێنیـت، نەخـشەیەکی سـاغی پـێ بکێـشیت، ئامانجـەکانت بزانیـت، کارایـان بکـەیت، هـەڵیان سـەنگێنیت، هـەمواریان بکـەیت، جـارێکیتر بیانخەیتـەوە کێـشانەی بـەراوردکاری نـەرمو نیانیـت هـەبێت ئەمانـە هـەموویان بـۆ بابـەتێن" ئایندەت درووست بکە"

بەدرێـژایی تەمـەنت هەمیـشە بڵـێ: خـوای گـەورە مـن هـەموو هۆکارەکـانم هێنـا، پـشتم بـەتۆ بەسـت، خـوای گـەورەش ئـەو جـۆرە پـشت پـی بەستوانەی خۆش دەوێت...

هۆكارەكـــان نـــاوەكين، پـــشتبەخوابەستن لەناخدايــــە، جيهـــانى نـــاوەوە بـــەرەو خـــوا دەچـــێت، جيهـــانى دەرەوە تـــەنها جوڵـــە دەكـــات بـــەڵام بزانـــە تـــەنها نيـــت، پـــشتت بـــەخوا بەســـتوە، ئـــەم رِســـتەيە زۆر گرنگـــە، زۆرێـــك هـــەن هۆكارەكانيـــان هەيـــەو ســـەركەوتو نـــابن، وادەزانـــن تـــەها بـــەهۆكارەكان ســـەركەوتن دەســـتەبەر دەبێـــت، بـــەڵام رِەخـــسێنەری هۆكارەكانـــە ســـەركەوتن دەكاتـــە بەشـــی و، كەســـی ســـەركەوتو ديارێـــدەكات كاتـــێ دەچـــێتەوەلای رِەخـــسێنەری هۆكارەكـــان كەپـــەروەردگارە دەبينـــی ئەوانـــەی خۆشـــدەوێت كەپـــشتی پێدەبەســـتن، لێـــرەدا خـــۆت دەبينيـــت رِێبـــوارێكی رِێگـــەی هێـــزی خودیـــت. ئێـــستا تواناكانمـــان بـــەكاربرد، بـــا دەسبەكاربين لەگەڵ يەكتر دوبارەی بكەينەوە لەسەرەتاوە.

- پـــەيبردن..دەركـــت بـــەتواناكانی خـــۆت كـــردوە يـــان ..نـــا؟! ئايـــا پەشـــيمان دەبيتـــەوە بـــەهۆی قـــسەی خەڵكيـــەوە، يـــان پـــەيت بـــەتواناكانت بـــردوە، دەزانيـــت باشـــترين بـــەديهێنراوی خـــوای پەروەردگاريت؟!
- پێپەسەند بوون: ئايا خۆتت بەتەواوی پێ پەسەندە يان...؟!
- برِيار: ئايا برِيارتداوە تواناكانت بخەيتە گەرِ يان...نا؟!
- هەڵبژاردن: ئايا رِەفتارێكی گونجاوت هەڵبژاردوە يان..نا؟!
- بەرپرســياريتی: ئايــا دەچــيتە ژێربــاری بەرپرســيارێتيەوە يــان لۆمــەی كـــەس ناكـــەيت، رِەخنـــە ناگريـــت، بەراوردناكـــەيت، رِژدی نابـــەيت، ئەمانـــە هـــەموويان كاتـــت بـــەفيرِۆ ئـــەدەنو حـــەرامن، يـــان هـــەر بەردەواميت لەسەريان...؟!

- پـاك كردنــەوەی رابـردو: ئایـا خۆتــت لــەرابردو پاككردۆتــەوە. رابــردوت پاكبكــەرەوە پەنـدی لێـوەرگرە، مـادام لیـوەی فێربیـت، بۆیـە هەرچـەن بـیری لێبكەیتــەوە دڵتــەنگ نابیــت، مــادام دڵتــەنگ نــەبیت، دەبنــە لێزانیی‌و ئەوا هەستە ناقۆڵاكان خۆیان دەشارنەوە.
- رێكخــستنی هەنوكــەیی: ئایــا ریكخــستنت بــۆ ئێــستا كــردوە؟! یەكەمایەتیەكانت چین؟! زیاتر چیت دەوێت؟! هەموویان بنوسە.
- ئامـادە بـە بـۆ ئاینـدەت: ئایـا ئامـادەیی تـەواوت هەیـە بـۆ ئاینـدە؟! شــارەزایی تــەواوت هەیــە؟! ئایــا لێهاتویــت؟! ئایــا دەســبەكاربویت لەخوێندنــەوەی بیــست خولــەكی؟! ئایــا رۆژانــە گوێبیــستی كاســێتێك دەبیــت؟! دەســبەكاریت لەبیركردنــەوەی گونجــاوو نــەریێ؟ گــەر تەنگەژەیــەك لەریگەتــدا هەیــە بــیرت لــەوە كردۆتــەوە چــۆن یــەكلایی بكەیەتــەوە! مەچــۆرە نــاو گرفتێكــەوە بیتــە بەشــێك لــەو گرفتــە، دەمەوێ بەجۆرێك بیتە بەشێك لەو گرفتە لێوەی فێر بیت بۆ ژیان.
- نیـاز: ئایـا نیـەتێكی بـێ خەوشـت هەیـە بـۆ پـەروەردگار، ئایـا نیـەتت هەیـە هــەموو توانـا بێـسنورەكانت بخەیتـە گـەڕ، ئایـا نیـەتت ئەوەیـە هــەموو هۆكارەكــان بگریتــە بــەر، گــەر بەچــۆكدا هاتیــت جــارێكی دیكــە هەستیتەوە، گــەر پێـنج جـار كـەوتیت شەشـەم جـار هەستیتەوە، گــەر حــەوت جــار كــەوتیت ســەری هەشــتەم هەســتیتەوە.. بــەمجۆرە ئامانجـەكانت بـەدی بێنیـت، ژاپۆنیـەكان شـتێكی گـەورە دەڵـێن: گـەر كـەوتیت بەســەر پــشتدا بكــەوە، دەتوانیــت ســەیری ســەرەوە بكــەیت، كاتــێ ســەیری ســەروەت كــرد بــەرەو ســەرەوەش هەڵدەســیتەوە، بــەمجۆرەش بــەرەو رێگــەی ئاینــدەت دەبزوێیــت‌و ئامانجەكــەت بــەدی

دێنیت، مادام تۆنیەتت هێناوە دەبێت گوێڕایەڵی تەواویشت هەبێت، گوێڕایەڵی پەروەردگار بیت تاکو ئایندەت بۆ بسازێنێت، بگەیتە ڕاپەڕین، کاتێ خۆتت بەئاگا هێنا پەیت برد بە توانا بێسنورەکانت، خۆتت بەتەواوی پێپەسەند بو، بەم قۆناغانەدا تێپەڕت کرد، ئەوا گوێڕایەڵیەکی تەواوت بۆ پەروەردگار دەبێت، دەڵێیت: خوای گەورە من نیەتم هەیە گوێڕایەڵێکی تەواو بم، بۆ ئەوەی بەهەڵەدا نەچم لەم ڕێگەیەدا، بچم بۆ ڕێگەی جگەرەکێشان‌و مادە هۆشبەرەکاندا، مادام گوێڕایەڵی تەواو هەیە کەواتە بێخەوشی.. بێگەردی‌و بێخەوشی، هیچ شتێك نییە باشتر بێت لەبێخەوشی، مادام گوێڕایەڵی پەروەردگاریت، خۆشتدەوێت‌و پێی بڕواداریت دەبێت بێخەوشی بۆ دەربڕیت. مادام فێری بێخەوشی بویت کەواتە تۆ کەسێکی بێخەوشیت بۆ خوای پەروەردگار، بێخەوشیت بۆ خودی خۆت، بێخەوشیت بۆ خەڵکیش، بۆکارەکەیشت بێخەوشیت، کاتێ بێخەوشی بۆ شتێك دەربڕیت ئەویش هەمانشێوە بۆت دەردەبڕێتەوە خۆشی دەوێی، بیرت نەچێ هەرچیت بوێت دەیەوێت، بۆی دڵسۆزبە بۆت دڵسۆز دەبێت، هەرچی لەناو بەریت لەناوت دەبات، مادام بیر لەشتێك دەکەیتەوە دەیخەیتە پەیبردنتەوە دەبێتە وجودێك لەویژدانتدا، گەربیخەیتە ئاستی کردارەوە دەبێتە وجودێك لەچارەنوستدا.

ئێستا هەنگاوی دوای ئەمانە ئەمەکداریە:

یان بڕوا بەخوا بوون، بێخەوش بوون بۆی، ئەمەکداری پەیوەستە بە(عیرفان)ەوە بزانە کەسێك داوەتێکی ئێوارەت دەکات، پێی دەڵێیت

سوپاس، عیرفان ئەمەیە پێزانینی بۆ دەردەبڕێت، پێزانینیش بەردەوامەو لەزەمەندایە، هەرگیز لەبیری مەکە، بزانە خوای پەروەردگار بەدیهێناویت، هەموو ئاسمان‌و زەوی‌و ئەوەی لەنێوانیاندایە بۆی ملکەچ کردویت ئەمانە شایانی پێزانینە، هەمیشە بڵێ سوپاس بۆ پەروەردگار وەك دەفەرموێت:

لئن شکرتم لأزیدنکم

ئەمەش پاك‌و بێگەردی‌و حوکمی پەروەردگارە،، ئێستا تەواو ئامادەین بۆ دروست کردنی ئایندەمان.

ئایا تۆیش ئامادەیت بۆئەوەی ئایندەیەك بۆخۆت دروست بکەیت؟! ئایا دەتەوێ بەبەختەوەری بژیت؟! ئایا حەزدەکەیت بگەیتە قۆناغێك هیچ کەمو کورتیەکی دەرامەتت نەبێت؟! ئایا حەز دەکەیت شوێن پەنجەت لەدنیادا دیار بێت؟!

کەواتە کاتی خۆیەتی:

تۆلەهەموو حاڵێکدا دەژیت، کەواتە بەدروستی بژی، لەهەموو حاڵێکدا دەخۆیت، کەواتە بەشێوازێکی دروست بخۆ، لەهەموو حاڵێکدا هەناسە ئەدەیت، کەواتە بەشێوازێکی دروست هەناسە بدە، لەهەموو حاڵێکدا دەچیتە هاوسەرگیریەوە، کەواتە بەشێوازێکی دروست بچۆرە ئەو قۆناغەو بەخۆشی تیایدا بژی، دەتەوێ وەچە بخەیتەوە، کەواتە باوکێکی سەرکەوتوبە یان دایکێکی سەرکەوتوبە، تۆ خاوەنی زانیاریت، ڕەخنە لەخەڵکی مەگرەو هەوڵبدە فێریان بکە، تۆ خاوەنی سەروەت‌و سامانیت، دەستی یارمەتی بۆ خەڵکی درێژبکە، کەواتە ئێستا کەناڵێکت کردۆتەوە لەنێوان خۆت‌و خوای گەورەدا، وریابە مەڵێ من ئەمەو ئەوەم

دا بـــەڵام كـــەس هيـــچى بـــەمن نـــەدا، بەرلـــەوەى هەرچـــى ببەخـــشيت پێـــشوازيان لێبكـــە، هەرچـــەن زيـــاتريش ببەخـــشيت لەئاينـــدەدا زيـــاتر دەبێت.

ئێستا بابچينە سەربەشى دووەمى بنەڕەتى ئەويش:

## "چۆن ئاينده دروست ئەكەيت"

بۆئـــەوەى ئاينده‌يـــەك دروســـت بكـــەيت چـــاك بزانـــە تـــۆ لەمـــساتەدا دەژيـــت لەوانەيـــە دوايـــن ســـاتى ژيانـــت بێـــت، بەخۆشەويـــستى خـــواى گـــەورەوە بـــژى، بەگوێڕايـــەڵى ئەوەوەبـــژى، بێخەوشـــى بـــۆ دەربـــڕە، ئەمەكداريـــە بـــۆى، هەســـت بەچـــێژى ئيمـــان بكـــە، چـــونكە بەهـــەموو جەســـتەتدا بـــڵاوەى كـــردوە، هەســـت پێبكـــە، باكردەوەكانـــت هاوتـــاى كردەوەكـــانى پێغەمبـــەر بێـــت، كـــەخواى گـــەورە پێـــى دەفـــەرموێت: وإنـك لعلى خلق عظيم

چەن جوانە ووتەكەى شوقى:

إنما الامم الاخلاق ما بقيت فإن همو ذهبت أخلاقهم ذهبوا

ئەمەيـــە ڕەوشـــت، دواى ئـــەوە بزانـــەو لەپێغەمبـــەرەوە فێربـــە لـــەهاوەڵان‌و پياوچـــاكان بەڕەوشـــتى بـــەرزەوە ژيـــاون، پاشـــان بخوێنـــەرەوە وەك دەفـــەرموێت (اقـــرا) ئەمـــە فـــەرمانێكى ڕاســـتەوخۆيە بـــەردەوامى لەگـــەڵ زەمەنـــدا هەيـــە، دەبێـــت بخوێنيتـــەوە، گەشـــە بـــەخۆت بـــدەيت بـــەردەوام، كاتـــێ گـــەورەمان حـــەزرەتى جوبرەئيـــل سروشـــى بـــۆ ســـەروەرمان محمـــد(ص) هێنـــا فـــەرمانى پێكـــرد(اقـــرا) پێغەمبـــەر فـــەرموى مـــن خوێنـــەوەارنيم، ســـێ جـــارى لێـــى دوبـــارە كـــردەوە پاشـــان فـــەرموى: إقـــرأ

باسم ربك الذي خلق، خلق الانسن من علق، إقرأ وربك الأكرم، الذي علم بالقلم، علم الأنسان ما لم يعلم.

ئەمەش نەرمی‌و نیانیە چونکە پێغەمبەر دەیویست لێرەدا بزانێت چی بخوێنێت، ئەمەش خۆشەویستی زانستو زانیاریە، دەبینین دوبارە دەفەرموێت:وعلم آدم الأسماً كلها

هیچ زانیاریەك نیە ناوی هیچ کەسێك نیە، دەبێت خۆشەویستی زیاترت هەبێت بۆ پەروەرگار هەستەو بیزوێ دورکات نوێژ بکەو بابچینە سەر بەشی دووەم بۆئەوەی بزانین چۆن ئایندەمان دروست بکەین.

## بەشی یەکەم :

## ئایندەت دروست بکە

بەشی ... م:

**وقل إعملوا فسيرى**

**الله عملكم ورسوله والمؤمنون**

**ئاییندەت دروست بکە: پەروەردگار دەفەرموێت:**

**وقل إعملوا فسيرى الله عملكم ورسوله والمؤمنون**

خـــوای گـــەورە هانمـــان ئـــەدات بۆکـــارکردن، گـــەر کاربکـــەیت دەســـــکەوتت دەبێـــــت، لـــــەخۆت ڕازی دەبیـــــت چـــــونکە خۆتـــــت بەرجەســـتەکردوە، خـــۆ بەرجەســـتەکردنیش لەمیانـــەی لەخۆگەیـــشتنندایە، لەخۆنرخاندنیـــشدا تۆباشـــتر دەبیـــتو زیـــاتر لـــەخۆت ڕازی دەبیـــت، وێنـــە خودیەکـــەی خـــۆت چـــاکتر دەبێـــت، زیـــاترو زیـــاتر لـــەخۆت ڕازی دەبیـــت، زیـــاترو زیـــاتر خـــۆت بەرجەســـتە ئەکـــەیت، متمانـــەت بـــەخۆت زیـــاتر ئـــەبێت، دەتـــەوێ لەســـەرەتاوە دەســـکەوتت هـــەبێت، ئەمـــەش بەخشایـــشی خـــوای پـــــەروەردگارە، مـــــن بەســـــەر ئـــــەم زەویـــــەدا دەڕۆم وەك پـــــەروەردگار دەفەرموێت: هو الذي جعل لكم الأرض ذلولا فأمشوا في مناكبها

خـــوای گـــەورە زەوی بـــۆ فەراهـــەم هێنـــاوینو فـــەرمانمان پێـــدەکات بەســـەریدا بـــڕۆین، دەیـــەوێت لەســـەری بجولێیـــت، بڕیـــار بـــدەیت، نەخـــشە بکێـــشیت، بونیانـــت بنێیـــت جێبـــەجێ بکـــەیتو بـــژیت تیایـــدا وەك دەفـــەرموێت: وقـــل أعملوا فسيرى الله عملكم ورسوله والمؤمنون

ئێـستا کـاتی ئەوەیـە ئاینـدە دروسـت بکـەیت، تـۆ دروسـتکەری ئاینـدەیت، بەبیرکردنەوەکانت بەڕەفتارەکانت، لێرەدا شوقی دەڵێت:

وما نيل المطالب بالتمني ولكن تؤخذالدنيا غلابا

**نابێـت کەسـێك لەماڵـەوە دانیـشێتو چـاوەڕوان بێـت بـەخت لـەدەرگای بـدات، بـەخت زۆرجـار لـەدەرگا نـەدات، بـەڵام تـۆ لـەماڵ نیـت، دەچـێت لـەماڵی هاوسـێکەت ئەدات.**

کاتێ بیردەکەیتـەوە بـەڵکو بـەخت یـاوەرت بێـت ئەمـە تـەنها بەئاواتـەخواز بـوون نابێـت، ئایادەکرێـت ئاواتـەخواز بیـت بـچیتە کۆلێـژی پزیـشکی بـەڵام لەدواناوەندیـدا بکـەویت، ئەمـە هـەرگیز نابێـت، بـەڵکو بەبیرکردنـەوەی دروست دەبێت :

خلیل متران دەڵێت:

| | |
|---|---|
| اعزم وكد فإن مضيت فلاتقف | واصبر وثابر فالنجاحمحقق |
| ليس الموفق من تواتيه المنى | لكن من رزق الثبات موفق |

یەکێك لەفەیلەسوفەکانی ئیغریقی دەڵێت:

پێویـستە مـرۆڤ لەهـەوڵو تێکۆشـاندا بێـت بـۆ ئـەوەی پـەروەردگاری ڕێگـەی سەرکەوتنی بۆ والاکات.

ئێـستا بـا سـەرێك بـدەین لەسـتراتیژەیەکی تـەواو بۆئـەوەی ئایندەیـەکی پرشنگداری پێ دروست بکەیت بەویستی پەروەردگار.

یەکـەمین شـتێك بـیری لێبکەیتـەوە ئەمەیـە"مەبەسـت" ئەمـەش واتـا بزانیـت چـیت دەوێـت بـە ڕوونـی، جـا ئەگـەر مـەودای کـورت بێـت یـان مەودایـەکی درێـژی هـەبێت، هەنـدێ کـەس جیـاوازی ناکـەن لـەنێوان ئامـانج، مەبەسـت، ئەندێـشە، ئامـانج بـەردەوامی لەزەمەنـدا هەیـە، مەبەسـت شـتێکە دەتـەوێ

پێـی بگـەیت، ئـەی ئەندێشەکانت چیە؟ئەوشـتە چـیە دەتـەوێ پێـی بگـەیت زیاتر لەهەموو شتێك لەژیانتدا؟

چۆن خۆت دەبینیت؟ لەڕوی داراییەوە باشیت یان...نا؟

دڵخۆشیت یان...نا؟

ئەمانـە مەبەسـتەکانتە، کاتـێ چـاوەکانت لێـك دەنێیـت ئەمانـە دەبینیـت، مەبەسـت شـتێکە ئەتـەوێت لـەماوەی ١٠ بـۆ ٢٥ سـاڵدا بێتـە دی، لەوانەیـە یـەکێك لەئێمـە بڵێـت: تەمەنـەکان بەدەسـتی خـوای گـەورەن، ئەمـە تـەواوە، بـەڵام خـوای گـەورە ئـەو مێـشکەی پێـداوین بـۆ ئـەوەی بـیری پیپێبکەینـەوەو نەخشەی پێ بکێشین، ئایا تۆ بیردەکەیتەوە نەخشە دەکێشیت؟

یـان یـەکێك بڵێـت: مـن مەبەسـتەکەم ئەوەیـە خـاوەنی کۆمپانیایـەکی ئـەلکترۆنی گـەورەبم، یـان کۆمپانیایـەکی گەشـەی مرۆیـی، ئەمـەیان ئەندێـشەیەکە، گـەر لێـی بپرسـیت کـەی ئـەم مەبەسـتەت ئامـادە دەبێـت؟ دەڵێـت لـەماوەی دەسـاڵی داهـاتودا، دوای ئەمـە دەبێـت لـەم مەبەسـتەدا ئەندێـشەیەکت هـەبێت، ئەندێـشە دەبێـت بـەپێی ڕەزامەنـدی خـوای گـەورە بێـت، پەیوەسـت بیـت پێیـەوە لێـی نزیـك بیـت، گـەر وانـەبێت ئـەوا دەبێتـە سـەرکەوتنێکی دنیـایی بـەردەوامی نابێـت، کـاتی دەڵـێم: مەبەسـتەکەت چیە؟ دەڵێیـت: کۆمپانیایـەکی ئـەلکترۆنی... مەبەسـت چـیە. ئـەویش نزیـك بونەوەیـە لـەخوای گـەورە، ئەمـە چـۆن دەبێـت؟ چـونکە بەهۆیـەوە یارمـەتی خـەڵکی پێئـەدەیت، فێریاندەکـەیت خـوای گـەورەیان چـۆن خۆشـبوێت، لـەخوای گـەورەیان نزیـك دەکەیتـەوە، هـەتیوێك لەئەسـتۆ دەگریـتو فێـری دەکـەیت، یـان یارمـەتی خوێنـدکارێکی هـەژار ئـەدەیت، یان دەستی یارمەتی بۆ خێزانێك درێژ ئەکەیت..

ئەمانــە ســەرجەمیان لــەخوای گــەورەت نزیــك ئەكەنــەوە، بــەردەوامی بەســەركەوتنەكانت نــەدەن، لــەهیچ شــتێكی دارایــی كــەمت نابێــت. وك عبداللــهی كــوڕی عــەمرۆ دەڵێــت: لــەدنیادا وابــژی وابزانــە هــەرگیز نامریــت، كارێك بۆ قیامەت بكەوابزانە سبەی دەمریت.

گــەر ســەرنج بــدەیت لــەم پەنــدە، دەبینیــت دەبێــت كارێــك بــۆ دنیــا بكــەیت پێویــستە بیبەســتیتەوە بەهەســتەكانت ئامانجــەكانت ڕەفتارەكانــت، بــەڵام گــەر بزانیــت ســبەی دەمریــت بــەم بــیرو ڕایەشــەوە بــژیت دەبینیــت دەبێــت لــەدنیا دابڕێیــت هەســتەكانو ڕەفتارەكانــت پەیوەســتن بــەڕۆژی دواییــەوە.. دەبێت چۆن لەیەك كاتدا دابڕاوو پەیوەست بین؟

ئەمــە واتــای پەیوەســت بیــت بەدنیاوەچــێژی لێوەرگریــت بــەوەی بیرلــەڕۆژی دوایــی بكەیتــەوە، مــردن ئــەم ساتەیە، ئــەوا بەهاوســەنگیەوە بــژی، دنیــا وەك ڕێگەیــەك بــۆ ڕۆژی دوایــی بــەكار بێنــە، ڕۆژی دوایــش بارێگەیــەكی ڕۆحــانی دنیــا بێــت، بــەمجۆرە ســەركەوتویەكی هاوســەنگ دەبیــت بەردەوامی دنیاو ڕۆژی دوایی دەبیت.

ئەمــەش دەمانگەیەنێتــە قۆنــاغی دواتــر بــۆ ڕێگــەی ئاینــدەمان ئــەویش

**حەزێكی ئاگرینە:**

مەبەســت خــۆراكی ڕەفتــارە، حــەزی ئــاگرین ســوتەمەنیەكی بەهێزەو بلێسەدارە پاڵ بەمرۆڤەوە دەنێت بۆكردار.

بەڵام چۆن دەتوانیت حەزێكی ئاگرین بەدەست بێنیت؟

وەڵام ئاسانە.. بە هۆكار:

كاتــێ مەبەســت ئاشــكرا بــوو ئــەوكات هێزێــك دەبەخــشێت پــاڵی پێــوە دەنێــت بــۆ پێــشەوە، گــەر پەیوەســت بیــت بــە ئــەركێكی ڕۆحانیــەوە زیــاتر

میلی بەدیهێنانت دەبێت، گەرلانیکەم پێنج هۆکار بدرێتە مەبەست پاڵت دەنێت بەرەو ڕەفتار:

کەواتە ئەو هۆکارانەی دەیدەیتە خۆت، ئەمەش لەپێناو بەدیهێنانی مەبەستەکەتدا دەبێتە هۆی حەزی ئاگرین.

بائێستا بپرسم:

ئایا مەبەستەکەت ڕون و ئاشکرایە؟

ئایا دەزانی چیت دەوێت؟

ئایا دەزانیت ئەندێشەی مەبەستەکەت چیە.ئایا ئەندێشەت بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکەت ئەوەیە زیاتر لەخوای گەورە نزیک بیتەوەو پەیوەست بیت پێیەوە؟

ئایا حەزەکەت ئاگرینە بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکەت؟

یان بڕیارتداوەمەبەستەکەت بەدی بێنیت جا بارودۆخ هەرچۆنێك بێت یان کاریگەریەکان یان قسەو قسەلۆکی خەڵکی.

ئەمەش ئەتگەیەنێتە قۆناغی دواتر لەڕێگەی دروستکردنی ئایندەکەت ئەویش:

**بڕوای خودی:**

بڕوا مەرجی نیە ئەوشتە ڕاستی بێت یان خەیاڵ، واقیعی بێت یان نا، بەڵکو مەرجەکەی ئەوەیە ئەوەی بڕوات پێیەتی، دانایە کەسێك مەبەستێکی ئاشکراو ئەندێشەیەکی ڕۆحانی حەزێکی ئاگرینی هەبێت، بەڵام بڕواناکات لەتوانایدا مەبەستەکەی بێنێتە دی، بۆیە ئەو مەبەستە نایەتە دی.

بـڕوای خـودی بـەهێز پاڵنەرێکـە بۆحـەزێکی ئـاگرین، ڕۆڵـی ئـەو پاڵنـەری مەبەسـتێکی ئاشـکرایە، دواجـاریش دەبێـت پەیوەسـت بێـت بەڕەزامەنـدی پـەروەردگارەوە ئـەکات بـەردەوام دەبێـت لەزەمەنـدا، سـەرکەوتنی دنیـاو قیامەت دەبەخشێت.

**بائێستا بپرسم:**

ئایا بڕوات وایە بەویستی خوای گەورە مەبەستەکەت بێتە دی؟

ڕێژەی بڕوابونت چەندە؟

ئەوشتە چیە دەتوانێت لەباوەڕت کەم بکاتەوە؟

گـرنگ ئەوەیـە بزانیـت بۆئـەوەی بتوانیـت مەبەسـتەکەت بێنیتـە دی، دەبێـت حـەزێکی ئاگرینـت هـەبێت، بـاوەڕی خودیـت پاڵنـەر بێـتو بەهێزبێت بۆئەوە.

لەمەسـتێکی ئاشـکراوە بـۆ ئەندێـشەیەکی ڕۆحـانی ..بـۆ حـەزێکی ئـاگرین..بـۆ بڕوایـەکی خـودی.. بـەردەوامی گەشـتەکەمان دەبـین بـۆ دروستکردنی ئاینده تادەگەینە ئەم وێستگەیە ئەویش:

**ئامانجەکان:**

لەوێنـەی خودیـدا جیهـانی دەرەکـی جیاوازیـەکی نییـە لەگـەڵ جیهـانی ناوەکیـدا، هەرچـەند جیهـانی نـاوەکی لاوازبێـت جیهـانی دەرەکـیش لاوازە، وێنـەی خـودی ئـەو ێنەیـەی دەیکێـشیت بۆخـۆت بـەهۆی بڕواکەتـەوە، بـەهۆی بـیروڕای خـەڵکی، لەوانەیـە یـەکێك هانـت بـدات، یارمـەتیت بـدات، گـەر مامۆسـتاکەت هانـت بـدات ئـەوا لـەناخی خۆتـدا وێنەیـەکی خـودی بـەهێزت دەبێـت، چـاوەکانت لێـك بنـێو هەناسـەیەکی قـووڵ هەڵمـژە، وێنـەیك بۆخـۆت بکێشە، ئـەم وێنەیـە هـەموو ئـەو ڕەنگانـەی

تیایــە کــەتۆ حــەزیان لێدەکــەیت، ڕوناکیــەکی بــدەرێ، ئــەنجا خــۆت بخــەرەنێو وێنەکــەوە تــۆ ئامانجەکــەت بــەدی دێنیــت، تــۆ مەبەســتەکەت بــەدی دێنیــت، بەئاشــکرا ڕونــی بکــەرەوە، پاشــان لێــی وەرە دەرەوە وزەیــەك بــدەرە خــۆت، هــەموو ڕۆژێــك، بەرلەنوســتن بەتاییــەت ســەیرێکی ئــەم وێنەیــە بکــە، ڕونو بــەهێزە، هــەرکاتێك لەناخــەوە ســەرنجی ئــەدەیت، زیــاتریش لــەدەرەوە دەیبینیــت، هــەموو ڕۆژێــك بــەیانی چاوەکانت لێــك بنــێ ســەرنجی ئــەم وێنەیــە بــدە تــاکو لەبیروەریەکانتــدا خــۆی داکوتێــت، بــچێتە نــەقڵی ناوەکیــەوە، تــاکو دەبێتــە نــەریتو خــوو، هەرکەســێك بیــەوێت لەکەداری بکات ناتوانێت.

إن الله لایغیرو ما بقوم حتی یغیروا ما بأنفسهم

ناتوانیــت جیهــانی دەرەوە بگۆڕیــت تــاکو جیهانــە ناوەکیەکــەی خــۆت نــەگۆڕیت.. لەمەبەســتەوە بــۆ ئەندێــشە.. بــۆ نیــاز.. لــەبڕوای خودیــەوە بــۆ وێنەی خودی لەوێشەوە بۆ ئامانجەکان.

بۆنمونــە تــۆ دەتــەوێت کۆمپانیایــەکی گــەورە بکەیتــەوە، نیــازی تــۆ لــەم کۆمپانیایــە یارمەتیــدانی کۆمــەلێکی خەڵکــە، بــڕوا خودیەکــەت بەویــستی خــوا هەرچــەند بــاودۆخی نالــەبارو ئاســتەنگ هــەبێت بــەدی دێنیــت، گەرکەسێکیش پێــشتر ئەمــەی بــەدیهێنابێت ئــەوا مــن باشــتر بــەدی دێــنم، گەر کەسێکیش نەبوو ئەمەی بەدیهێنابێت من دەبمە ئەو یەکەم کەسە.

دوای ئەمانە دەڵێین:

مەبەســت دەبێــت بکرێــت بەچــەند بەشــێکی بــچوکەوە، هــەر مەبەســتێك لەجیهانــدا مــادام دابەشــکراوە بەچــەند ئامــانجێکی بــچوکەوە ئــەوا لەگــەڵ ئامانجەکانتــدا، تواناکانتــدا، سەرچــاوەکانتدا یەکدەگرێتــەوە، پاشــان

دەگەیتــە قۆنــاغی دوای ئــەوە، هــەرکات ئامــانجێکی ســادەت بــەدیهێناو دەســـتت کـــەوت، هـــەرکات پێــشکەوتنی خۆتـــت بینـــی ئـــەوا وێنـــەی خودیەکــەت بــەرەو باشــترو باشــتر دەچــێت، متمانــەت بــەهاوڕیکانت پــتر دەبێــت، خــۆت بەرجەســتە دەکــەیت، وەك پــەروەردگار دەفــەرموێت:وقــل إعملوا فسيرى الله عملكم ورسوله والمؤمنون

کاتــێ ئێمــە منــاڵ بــوین بــەباوكو دایكمــان دەوت: بــاوكم خۆشــدەوێت یــان دایكــم خۆشــدەوێت.. گــرنگ ئەوەیــە لــەبارەی خۆتەوەبــدوێیت، .. تائێــستا خــەڵکی حــەز دەکــەن لــەبارەی خۆیانەوەبــدوێن،.. مــن فێربــووم..مــن سەفەرم کـرد..مـن چـەند زمانێـك دەزانم..مـن زۆر باشـم..مـن بـەهێزم.. مـن ئەمـەو ئـەوەم کـرد..هەریـەك لەئێمـە دەیـەوێت ڕوبـەڕوی کۆمەڵگـە بێتـەوە، بزانــە خــوای پــەروەردگار دەفــەرموێت: (وقــل إعملــوا فــسيرى الله عملكــم ورسوله والمؤمنون)

سـەرنج بـدە لەوشـەی( إعملـوا) دەبێـت بیرلـەکار بکەیتـەوە، دەبێـت لـەکاردا جەســتەت بجوڵێنیــت، کەبەدەســتت هێنــا ئــەوکات لــەخۆت ڕازیــت، وێنــە خودیەکـەت باشـتر دەبێـت، متمانـەت بـەخۆت بـۆ دروسـت ئـەبێت، خـۆت بەبەختەوەر دەزانیت لەژیاندا.

کاتــێ مــرۆڤ دەسکەوتێکی دەبێـت، بـەرەو پـێش دەچـێت زیـاترو زیـاتر بۆیـە پەروەردگار دەفەرموێت: (فسيرى الله عملكم.)

واتــا ئــەی بــەنی ئــادەم مــن ســەیرت ئەکــەم نــەك تــەنها هــەر ئەمــە بــەڵکو (ورسوله والمؤمنون)

بۆیـــە پێویـــستە ببزوێیـــت، کەواتـــە وەرە بـــا مەبەســـتەکان بکەینـــەوە دابەشیان کەین بۆ ئامانجەکان:

تـۆ دەڵێـت: مـن دەمـەوێ کۆمپانیایـەکی گـەورە بکەمـەوە، مەرامەکـەت ئاشـکرایە، مەبەسـتەکەش ئاشـکرایە، ئەندێـشەکەش ئاشـکرایە، ئـەویش نزیکبونەوەیـە لەپـەروەردگار، پەیوەسـت بـوون پێیـەوە، وێنـەی خـودیش ئەم ئاواتەم بۆدێنێتە دی.

ئەم کۆمپانیایەئایا پارەی پێویستت هەیە بۆ دروستکردنی؟

ئایا نەخشەیەکت بۆ کێشاوە؟

ئایا ئەو پارەیەی پێتە بەشدەکات یان کەمە؟

دەسـت پێبکـە.. هەرچـەن برێکـی کەمیـشت پێیـە دەسـتپێبکە، پـەرتوکێك بکـڕە بزانـە مانـای ووشـەی" پلانـی سـتراتیژە" چـیە بۆئـەوەی بگەیتـە مەبەستی ئەو کۆمپانیایەو بەدی بێنیت.

فێـری پەیوەنـدیکردن ببـە، چـونکە بێگومـان دەبێـت پەیوەنـدیت لـەنێوان خۆتو خەڵکیدا هەبێت.

زمان فێربە، فێری کۆمپیوتەرو ژمێریاری ببە.

دوای ماوەیـەك خـۆت دەبینیـت فێـری شـتگەلیك بویـت، هـەموو ئامانجێـك لەئامانجێکی دیکەت نزیك دەکاتەوە.

وایـدابنێ ئامـانج وەکـو پلـەی پەیژەیـەك وایـە، گەربتـەوێ سـەرکەویت بـۆ پلـەی دەیـەم، دەبێـت لەپلـەی یەکەمـەوە دەسـت پێبکـەیت، ئەمـەش دەبێتـە یەکـەمین ئامانجـت، هـەر ئەمەشـە دەتگەیەنێتـە ئامانجـەکانی تـرت، هـــەر پلەیـــەك لـــەم پلانـــە، لەخزمـــەتی مەبەســـتەکەتدایە، بـــەمجۆرە تۆدەتوانیـــت کۆمپانیاکـــەت بکەیتـــەوە، لەئەندێـــشەوە هـــەموو ئامانجێـــك لەخزمـــەتی مەبەســـتدایە، ئەندێـــشە هـــەرام زیـــاد ئـــەکات هێـــزی پێدەبەخـشێت،، هـەر ئامانجێـك مـسۆگەر بکـەیت بـەپێی تواناکـانی خـۆتن،

تـۆ تـەنها تـەرکیز دەکەیتـە سـەر ئامانجەکـە، ئەندێـشە لـەنێو وێنـە خودیەکەتدایـە، ئەندێـشەی ئاشـکرا، هـەرکات وێنەکـە بێتـە پـێش چاووت، ئـەوا بـەڕونی دەیبینیـت، ئەمـەش ئەوەیـە کەبـە ویـستی پـەروەردگار لـەماوەی بیـست سـاڵدا مـسۆگەری بکـەیت. ئەمـە پلانـەو ئەندێـشەیە کۆمـەکت ئـەکات، بـەڵام تـەرکیزت لەسـەر ئامـانج بێـت، هاوکێـشەیەکی زۆر گرنگـە،بزانیت جیـاوازی بکـەیت لـەنێوان مەبەسـتێك بتـەوێ لەئاینـدەدا مـسۆگەری بکـەیت، بـەڵام لەئێـستادا تواناکانـت دەڵـێن: کەئامانجـەکان مـسۆگەر بکـەین،، زۆرکـەس دەکـەوون کاتـێ سـەرنجی مەبەسـت ئـەدەن وادەزانـن هێـشتا ماویـەتی، بـەڵام گـەر دابەشـی بکـەیت بۆچـەن ئامـانجێکی بـچوك، هـەموو تـەواوی وزەکانـت بخەیتـە گـەڕ لەئێـستادا بـۆ مـسۆگەر کردنـی، ئەوئامانجـەی لەبەردەمتـە ئەوەیـە ئـەتوانێ مـسۆگەری بکـات، هەرکەمـسۆگەر بـوو دەبینیـت پـەرتوکی زیـاتری بـۆ دەخوێنیتـەوە، کەسـانێك دەبینیـت پێـشتر نـەتبینیون، ڕوبـەڕوی شـتگەلێك دەبیتـەوە پێشتر ڕوبەڕوی نەبویتەتەوە.

ئەمەیـە قەشـەنگی ئامـانج، هەرکـەبیرت لێکـردەوە، ئـەویش بـیرت لێدەکاتـەوە، بـەڵام تـۆ دەتـەوێ ڕاسـتەخۆ بـاز بـدەیت بـۆ پلـەی دەیـەم، بەڵام تەرکیز بکەیتە سەر پلەی یەکەم باشترە.

یەکـەمین شـت مەبەسـتە بەسـراوەبە ئەندێـشەوە، هێـزی مـەرام دەبەخـشێت، لەخۆتـدا بـڕوای پێدەکـەیت، لەناخـەوە دەیبینیـت، دەیکـەیت بەچـەن ئامانجێکەوە.. ئەمەیان زۆرباشە.

دوای ئەمە ڕاستەخۆ دەست دەکەین بەجێبەجێ کردن، بەڵام دەبێت شتێکی گرنگ بزانین ئەویش بوێریە، ئەمە ئەوشتەیە بەبێ ئەو هیچمان بۆ ناکرێت.

ئایا ئەم ئازایەتیە لەخۆیەوە دێت؟ نەخێر..

مرۆڤ خاوەنی بوێریەکە دەزانێت ڕێك چی دەوێت، دەزانێت بەڕێکی چۆن دەسبەکار بێت، بەڕێکی گەی دەسبەکار بێت.

یارمەتی ژمارەیەك لەخەڵکی ئەدات، ئەم بەتەنها بوێریت پێدەبەخشێت...

ئەی چی بوێری ئەوەستێنێت؟

ترس...ترس لەنادیارەکان..ترس لەناڕەزاییەکان.. ترس لەگاڵتە پێکردن.. ترس لەدۆڕاندن.. بەڵکو ترس لەسەرکەوتنیش!!

کەسانێك دەڵێن:

ئەوکەسانەی سەرکەوتوون یان دزن یان فێڵباز.. یان لەخوا یاخین، یان سەرکەوتن دەمکاتە کەسێکی خۆپەرست، بێگومان ئەم قسانە هیچیان ڕاست نین.

من دەمەوێت دوپرسار لەخۆت بکەیت کاتێ ڕوبەڕوی ترس دەبیتەوە ئەویش:

خراپترین شتێك چیە بەسەرمدا بێت؟

باشترین شتێك چیە بەسەرمدا بێت؟

بەردەوامبە سەرنجی هەردوچاوی ترس بدە، هەرکەسەیرت کرد لێی تێدەگەیت دەبینیت بۆت پێدەکەنێت، پێت دەڵێت: هەرگیز بۆ ئەوە نەهاتووم بتترسێنم، بەڵکو بۆ ئەوە هاتووم فێرت بکەم، من لەهەموو

شتێك باشترم بۆ فێربونت، بەڵام تۆ ناتەوێت فێر بیت، تۆ ناوت لێناووم ترس. بۆیە هەمانجۆری بیرکردنەوەکانی خۆتت بۆدێنم بەڵام گەر بیرم لێبکەیتەوە من خەڵاتی پەروەردگارم، من بونەوەرێکم بۆئەوەی فێرت بکەم چۆن پەند لەهەڵوێستەکان وەردەگریت، چۆن پێداگری زیاتر ئەکەیت، دیارە ئازایەتی دەبێت سوربونی لەگەڵدا بێت، تۆ بەسەر مەترسیەکاندا بەئازایەتی سەردەکەویت، ئازایەتی بیرکردنەوەکانت دەخاتە مەیدانی کردارەوە، دەتەوێ پەرتوکێك بخوێنیتەوە خێرا تەواوی بکە، کەسێکت خۆشدەوێت ئاگاداری بکەرەوە لەو خۆشەویستیە. وەك لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕێتەوە:

پیاوێك لای پێغەمبەری خوا دانیشتبو، کەسێك بەڕێبواری بەلایاندا تێپەڕی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ئەو پیاوەم خۆشدەوێت،

پێغەمبەر فەرموی: پێت وتووە؟

وتی: نا..

فەرموی: ئاگاداری بکەرەوە.

پیاوەکە بەدوای ڕێبوارەکەدا ڕۆشتو پێی وت: من لەبەر خوا تۆم خۆشدەوێت.

ئەویش وتی: ئەوکەسە خۆشی بوێت، کەمنت لەبەر ئەو خۆشدەوێت.

ئازایەتی ئەوەیە هەرکات بتەوێت ئاسودە بیت، تۆ خۆتت خستۆتە ئاستی کردارەوە، ئەمە ئەو ئازایەتیەیە کەلەبارەیەوە دەدوێین، ئەوەیە وات لێدەکات سەیری ترس بکەیتو بڵێیت: ناتوانیت هەڵوێستەم پێبکەیت، دەزانیت بۆچی؟ چونکە تۆ هاوڕێی منیت، خەڵاتی منیت، لەگەڵ مندایت، من دەمەوێیتو ئاواتەخوازم بۆت، دەبینیت ترسیش

پێتدەڵێت: من لەژیانی تۆدام بۆ ئەوەی باشتر بێت، پێشکەویت، بۆ ئەوەی لەم ڕەفتارە ناقۆڵایانە بەدور بیت، گەجگەرە کێشیت واز لەجگەرە کێشان بێنە، چونکە ناگونجێت لەگەڵ تۆدا.

ئازایەتی هێزێکە دەتبزوێنێت بەرەوپێشت ئەبات، دەبێت وێنە خودیەکەت ئاشکرا بێت، ئامانجەکان بناسیتو دابەشیان کەیت، هەموو ئامانجێکیان لەخزمەت مەبەستێکدا بێت، هەموو ئامانجێك لەخزمەت ئەندێشەیەکدا بێت، ئەنجا دوای ئەوانە ڕاستەخۆ ئازایەتی، دەبێت هێزی بوێریت تێدا بەرجەستەبێت، بیرکردنەوەکانت بخەیتە مەیدانی کرداریەوە پاشان بەرەو پلانی ستراتیژی.

ڕێك وەکو کەسێك بیەێت سەفەرێك بکات، ئایا دەتوانێت بڕوات بەبێ پێویستیەکانی سەفەر؟ بێگومان نەخێر.. دەکرێت سەفەرێك بکەیتو نەخشەیەکی بۆدانەڕێژیت؟ یان بێ ئەوەی بزانیت بەرەو کوێ دەچیت، یان بێئەوەی شوێنێکی حەوانەوە دەستنیشان بکەیت؟ یان بێئەوەی کەلوپەلی پێویستی ئەوشوێنەت پێبێت؟ یان بێئەوەی بودجەیەك بۆخۆت دیاری بکەیت؟

ئەمەش واتا دەبێت پلانێکت هەبێت بەهەموو هەوڵێکەوە ئامادەبیت هەبێت بۆ ئەو سەفەرە، کامیانت بەلاوە گرنگە، نەخشەیەك بۆ سەفەر یان بۆ سەرتاپای ژیانت؟! لەگەڵ ئەمەشدا لەدەخولەك یان کاتژێرێك زیاتر تێپەرناکات بۆ نەخشە ژیانت، بۆیە دەڵێم:

ئێستا لەگەڵ مندا وەرە، پێنوسو پەڕەیەك هەلگرە بانەخشەکەمان بکێشین:

لەپلانی ستراتیژیدا ئامانجەکەت بێنە، گریمانەکان دابنێ، چی ڕو ئەدات گەر بیخەیتە مەیدانی کردارییەوە، چۆن بەگژ ئاستەنگەکاندا بچەوە کەدەبنە لەمپەری ڕێم؟

یاسای زاڵبوون دەڵێت:

کاتێ بیرلەگریمانەکان دەکەیتەوە بۆ قەیرانێکی داهاتوو ئەوا زیاتر لەجێگرەوەیەکت دەبێت.

گەر وانەکەیت ناتوانیت ڕوبەڕویان بیتەوە، یەکەمین شتێك لەپلانی ستراتیژیدا، ئەمەیە بیرلەهەموو گریمانەکان بکەیتەوە ئەوانەی ڕێگریت ئەکەن لەمسۆگەر کردنی ئامانجەکانتدا، ئەوئامانجەی ئەتگەیەنێتە ئەومەبەستەی پێشتر چارەت بۆ کردبێت، بۆئەوەی ڕێكو پێك بێت، ئەقڵت ڕاهێنراوێکی زەینی بێت، بەڵام جەخار زۆرێك لەخەڵکی بەمجۆرە بیر ناکەنەوە، بۆنمونە قوتابیەکی دواناوەندی دەڵێت: من دەمەوێت لەکۆلێژی پزشکیدا وەرگیرێم، کەچی کەوەرناگیرێت دادەڕمێت، بەڵام لێرەدا جێگرەوەی تر هەن پێویستە قبوڵیان بکات:

جێگرەوەی یەکەم بچێتە کۆلێژێکی دیکە.

یان ئەوساڵەی دوبارە بکاتەوە.

بێگومان زۆرێك لەجێگرەوەکانت هەیە، بەڵام گەرتەنها یەك هەڵبژاردنت هەبێتو مسۆگەری نەکەیت، ئەوا دوچاری داڕمان دەبیت.

دوای جێگرەوەکان دەست دەکەینە ئەم هەنگاوە: ئەویش پلانی ستراتیژییە...

جێبەجێ کردن:

دەست دەکەین بەجێبەجێ کردن، تۆ جێبەجێکاریت، ئەوا ئامانجەکە هەنگاو بەهەنگاو جێبەجێ بکە. لەهەر هەنگاوێکدا هەڵوێستەیەك بکە پاشان ڕاستەوخۆ بەرەو هەنگاوی دواتر بڕۆ، ئەویش هەڵسەنگاندنە، تۆ جێبەجێکاری بەهایەکیت ڕاستەخۆ جێبەجێی دەکەیت، کاتێ جێبەجێ دەکەیت، وادەزانیت هیچت نەکردوە، ئەنجامێکی کارەکەت دیار نیە، بۆیە بێ هیوایی ڕوت تێدەکات، بۆئەوەی بێ هیوا نەبیت، بزانە نرخاندن زۆر گرنگە، بۆنمونە ئەوانەی ئەیانەوێت کێشی لەشیان کەم بکەنەوە دەستدەکەنە جێبەجێکردنی سیستمێکی دیاریکراوی خواردنەکان، بۆ ماوەیەك پابەندی دەبن پاشان ماندوو وەرس دەبن دەگەڕێنەوە سەر هەمان شێوازی جاران، هۆکارەکەشی لەمیانەی ئەم ڕۆتینەوە خۆی هەڵناسەنگێنێت، ئایا ئەم ڕۆتینە بەڕاستی باشە؟

ئایا لەم ڕێگەیە بەشێوازێکی دروست ئەجولێمەوە؟ ئەوانەی پێش من سەرکەوتوو بون... بۆچی سەرکەوتن؟ چۆن سەرکەوتن؟ تۆ بڵێی منیش سەرکەوتوو بم؟ یان بیرکردنەوەکانم هۆکارن کەمن ناتوانم سەرکەوتوو بم، دەبینیت لەخۆتدا بیرکردنەوەکانت هەمواردەکەیت، ئەمەش هەنگاوی دوای خۆنرخاندنە، دەبینیت ئازایەتی بوونی هەیە، هەموو گریمانەکانت داناوە، هەموو جێگرەوەکانت داناوە، جێبەجێکاریت، کاتێ دەچیتە سەر جێبەجێ کردن هەمواركردن دەست دەکەیتە هەموار کردن.

گەر بەڕێگەیەکدا بڕۆیت، لەپڕ گوڵاوێکت توش بێت، لێی هەڵخلیسکێیت، هەڵدەسیت بەپاککردنەوەی خۆت، سەیری گوڵاوەك دەکەیتو بیردەکەیتەوە، یان بازی بەسەردا ئەدەیت، یان ئەگەر گوڵاوەکە

گەورەبێت بەلای راستو چەپیدا دەڕۆیت، یان بەڕێی خۆتدا ئەگەڕێیتەوەو ڕێگەیەکی دیکە ئەدۆزیتەوە، بەمەشی هەڵسەنگاندنت کردوە، کەهەڵسەنگاندنت بۆ هەلوێستەکە کرد هەمواری دەکەیت و ڕێگەکەدەگۆڕیت، بۆئەوەی بگەیتە مەبەستەکەت بەمشێوەیە سەبارەت بەمەبەستو ئامانجەکان.

هەنگاوێك ئەتگەیەنێتە ئەوی دوای خۆی، تادەگەیتە هەنگاوی دواتر راستەخۆ لەپلانی ستزتیژیدا ئەویش زانینە...

تۆ دەزانیت پێشتر چی ڕویداوە، تەنانەت ئەگەر جارێکی دیکەڕوبداتەوە دەزانیت چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت..

ئەمەش مانای پلانی ستراتیژی بریتیە لەجێبەجێ کردنو هەڵسەنگاندن هەموارکردنو زانین..

جێبەجێکردنی هەمیشەیی لەزەمەنی بەردەوامدا، مادام تۆ هەر دەژیت، مادام زیندویتو هەناسە ئەدەیت تاکو دواین هەناسە بەردەوام هەموو شتێك هەڵسەنگێنە، پاشان هەمواری بکە، هەرکەزانیاریت لەبارەیەوە کۆکردەوە جارێکیتر جێبەجێی بکەبەشێوەیەکی ڕێکو پێك.

هەمیشە لەبیری نەکەیت شتێکی زۆر گرنگ، ئەویش سوپاسگوزاری پەروەردگارە چونکە خوای پەروەردگار ئەم هەموو بەخشینانەی پێبەخشیویت، چونکە هەنگاوی داهاتوو پێویستی بەهێزی تۆیە، بەرەنگاربونەوەیە، جا ئیتر ئەو بەرەنگاریە هەرچیەك بێت، مادام خۆڕاگریت بۆ توانادوە خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت:"إنما يوفون الصابرون أجرهم بغير حساب"

ئەوانەی خۆ ڕاگرو ئارامگرن دەچنە بەهەشت بەبێ چەندو چون، چونکە خوای پەروەردگار ئەو خەڵاتەی پێبەخشیویت ئارامگربیت، بۆئەوەی پاداشتت زۆرتر بکات، لێت ببورێت، کاتێ گەشتیتە قۆناغی دواتر ڕاستەخۆ دەبێت لەدواوە دەڵێیت: سوپاس بۆ ئەوپەروەردگارەی وایلێکردم سەرکەوتوبم، ئارام بگرم لەسەر ئەم کۆسپە، گەر ئەم کۆسپە نەبوایە نەمدەتوانی هێندە بەهێزبم.

پلانی ستراتیژی پلان و هەڵسەنگاندنەو هەموارکردن و فێربوون و جێبەجێ کردنە، لەهەمان کاتدا تۆ هەڵدەسیت بەبەکاربردنی هەموو ئەمانە سوپاسی پەروەردگار بکە بەدرێژایی ئەم گەشتە، بڵێ:

اللهم لك الحمد والشكر كما ينبغي لجلال وجهك وعظيم سلطانك وتعداد مخلوقاتك وسعة عرشك حتى ترضي يا أكرم الاكرمين، يارب أنا صابر.

قۆناغی دووەم: هێزی سێیانیە پێکهاتوە لەپابەندبوون، سووربوون، ڕێکخستن:

لەوانەیە پابەندیەکی تەواوت هەبێت بۆ لەخەوبێداربونەوەی بەیانیان زوو بۆ دەسکەوتنی شتێك، ئەمە پێی دەوترێت پابەند بوون، لەوانەیە کاتێك بێت بەسەرتدا تیایدا ماندوو بیت، نەتوانیت بێداربیتەوە، لێرەدا قۆناغی سووربوون هەیە، سووربوون واتلێدەکات جەخت بکەیتەوە لەسەر پابەندبوون، پێداگری لەسەر شتێك بکەیت بۆ پلەیەکی زۆر باڵا، سووربیت تا ئەو ئاستەی کەسێك نەتوانێت لەو کارەی ئەنجامی ئەدەیت ڕۆژێك لەڕۆژان پەشیمانت بکاتەوە، ئەمەشیان ڕێکخستە. ڕۆژانە کارێك بکەیت بەبێ دابڕان،ئەمەش واتا کەعائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە: ئەی پێغەمبەری خوا، چکارێك خۆشەویستە بەلای خوای گەورەوە؟

فەرموی : بەردەوامی هەرچەن کەمیش بێت. ئەمەش پێی دەوترێت ڕێکخستن، بەردەوامیەکی پێداگرانەیە پێداگری پێداگریە بەپابەندبوونەوە.مەبەست دەتگەیێنێتە ئەندێشە، لەخزمەتی مەرامێکدایە،، هەموو کەسانێك پابەندبوونیان هەیە بۆ ئەوەی دەوڵەمەندو سەقامگیری دەرونی بن، بۆ ئەوەی بچنە بەهەشت هەموومان پابەندین بەدینەوە، کەواتە بابپرسین، مرۆڤ بە چ شتێکەوە پابەند دەبێت، دەبێت پابەندبونەکەی گونجاو بێت واتە ئیجابی بێت،، لەوانەیە کەسێك هەبێت پابەند بێت بەڵام پابەند بوونەکەی نابەجێ بێت واتە سلبی بێت، وەك پابەند دەبێت و سور دەبێت ڕێکخستن دەکات لەسەر خووی جگەرەکێشان.

من توێژینەوەیەکم کرد بەناوی" سەرکەوتنی بێسنور" لەبارەی تۆماس ئەدیسۆن و پابەندبونەکەیەوە دوواوم ٩٩٩٩ جار شکستی خوارد بۆئەوەی بگاتە داهێنانی گڵۆپی کارەبایی، پابەندبوونی کوڵۆنیل ساندرز کەلە١٠٠٧ چێشتخانەدا شکستی خوارد، پابەند بوونی والت دیزنی کلە٣٠٢ بانکدا ڕەواجێکی نەبوو، هەروەها پابەند بوونی هۆندا ئەوی شتێکی خراپ لەدنیادا نەما بەسەری نەیەت، هەروەها پابەند بوونی هاجر لەسەفاو مەروادا ٧ کەڕەت، تاکو خوای گەورە ئاوی لەژێر پێیەکانی ئیسماعیلی کوڕیدا بۆ هەڵقوڵاند، ئەمانە هەموویان خاوەنی پاڵنەر، وزەو قاڵبوون، پاشان خستنە قۆناغی کردارەوە، خۆڕاگرو پابەندو پێداگرو ڕێکخەر بوون.

دەبینیت کەسێك کاتێ پەکی دەکەوێت، بەخوا دەڵێت: ئیتر بڕستم لێبڕا ماندوێتی بەسە، ئێستا کاتی ئەوە هاتوەئەوەی دەمانەوێ مسۆگەری بکەین..

من خودی خۆم کاتێ ئەندێشەو خەیاڵێکم دەبێت، نایەڵم کەس بزانێت تەنانەت ئەوانەی لەگەڵ خۆمدا کار دەکەن، بەڵام ئامانجەکەیان پێدەڵێم، چونکە گەر باسی بیرۆکەکانت بکەیت لەوانەیە بۆچونی هەڵەی یەکێك پشتت سارد بکاتەوە، یان وازت لەو بیرۆکەیە پێ بێنێت، پێشتر ئەندێشەکانم بەخەڵکی دەووت، چونکە ئەمانە هانیان ئەدام بۆ مسۆگەر کردنی، بەڵام کەبۆم مسۆگەر نەدەکرا گاڵتەیان پێدەکردم، بەڵام ئێستا دەڵێم: دیدو بۆچون شتێکی هەڵەیە، چونکە کاتێ دەدوێیت وزەیەك خەرج دەکەیت بەبێ مەودا، بەڵام دەبێت ئەم وزەیە لەکارێکدا بەکاربێنیت، ئەو توندیەی لەئاخاوتندا بەکاری دەبەیت دەبێت لەکرداردا بێت نەك لەقسە.

پلانی ستراتیژی دەبێت جێبەجێو هەڵسەنگاندنو هەموارکردنو زانین و جارێکیتر جێبەجێ بکرێتەوە لەگەڵ هەموو ئەمانەدا سوپاسو پێزانین بۆ پەروەردگار بکرێت، بۆنمونە تۆ پابەندبونو هێزێك بۆ فێربوونی زمان وەگەڕ دەخەیت، تۆ بەڕاستی پابەندیت، دەتەوێ فێر بیت، بەڵام لەقۆناغێکدا جەنجاڵیەك یان نەخۆشیەك ڕوتێدەکات ناتوانی تەواوی بکەیت، ئەمە پابەند بوونێکی لاوازە، چونکە گەر پێداگری لەسەر کارەکەبکەیت ئەوا پابەند ئەبیت پێوەی، بەڵام پێداگریو پابەندی هەفتەیەك یان دوان یان مانگێکەو دەوەستێت، ئەنجا ڕێکخستن دێتە گۆڕێ، ڕێکخستن واتا بەردەوامی، هەرچەن پابەند بیت بەشتێکەوە

سوربیت لەسەر پابەندبونەکەت، دوپاتی ئەو پێداگریە بکەیتەوە، بەمەش ئەو سێ قۆڵیە دێنە کۆتایی ئەمە ناوم لێناوە هێزە سیانیەکە.

پاشان قۆناغی دوایی ... نەرمو نیانیە:

بەهەموو شێوەیەك مەحاڵە ئایندە دروست بکەیت بێنەوەی میانەڕەو بیت لەکاتێکدا هیچ کام لەوانەی ئەتەوێ مسۆگەری بکەیت...

سەرنجی خەسڵەتێکی هاوبەشم داوە لەکەسایەتیە سەرکەوتوەکانی جیهان لەکاتێکدا بەرنامەی "چاوپێکەوتن لەگەڵ کەسانی سەرکەوتوو"م لەیەکێك لەکەناڵەکانا پێشکەش ئەکرد، چاوپێکەوتنم لەگەڵ ٣٠ کەسایەتی سەرکەوتودا ساز کرد، هەریەکێکیان لەوی تریان نایابترو دەگمەنتر بوون، لەبارەی زۆرێك لەهۆکارەکانە دەدوان، سەرەنجام هەمویان بەبێ جیاوازی ئەم سێ خەسڵەتەیان تێدا بوو:

- بڕوا بەخوا بوون.
- ئەندێشەی ئاشکرا.
- ئازایەتی بێسنور.

هێندە میانەڕەویان تێدا بوو، گەر توشی هەڵەیەکیش بوبێتن، پەندیان لێوەرگرتوە، دەسبەرداری نەبوون تاکو مسۆگەریان کردووە.

میانەڕەوی، وەك یاسایەك لەیاساکانی نەست دەڵێت: کەسی میانەڕەو دەتوانێت زاڵبێت بەسەر هەستەکانیدا، زیاتر ئامانجەکانی بپێکێتو مسۆگەریان بکات لەکەسێکی توندڕەو.

چونکە کەسی میانەڕەو دەزانێت چۆن بیربکاتەوە بەشێوەیەکی جیاواز، گەر بیری لەڕێگەیەك کردەوە نەیگەیاندە شوێنی مەبەست، ئەوا ئاراستەی بیرکردنەوەی بەجۆرێکی دروست ئەگۆڕێت، ئەمەش ئەو

ڕێبازەیە کەژاپۆنیەکان لەسەری دەژین، ئەوان بە سێ ووشەی سەرەکی گرەویان بردۆتەوە:

- سڵاوو هەواڵ پرسین.
- سوپاس کردن.
- بەردەوام بەرەو باشتر چوون.

منیش سەرنجی ووشەی چوارەمم داوە ئەویش نەرمیو میانەڕەوی بەردەوام، دەبێت هەموو ڕۆژێك خۆت باشتر لەدوێنێ بکەیت، گەر بیرت لەڕێگەیك کردەوە نەبگەیاندیتە شوێنی مەبەستەکەت، ئەوا نەرمبەو ئاراستەی بیرکردنەوەکەت بگۆڕە.

ئەمەش واتای هاوسەنگ بوونە، ڕێکخستنە، پێداگریە لەسەر مسۆگەر بوونی ئامانجەکان، گەیشتن بەمەبەستە، نەرمی لەڕەفتاردا، کاتێ دەڵێیت من میانەڕەوم و ئەنجامێکی دیکەت بۆهاتە پێش ئەوەنەبوو تۆ بیرت بۆکردبویەوە ئایا دەسبەردار دەبیت و لێی ڕادەکەیت؟

زۆر ئاگاداری ئەم خاڵەبە، چونکە خاڵێکی ئێکجار گرنگە، دەبێتە کێشەیەکی گەورەی زۆرینەی خەڵکی، بەڵام لەخۆت بپرسە:چی واتلێدەکات بیر لەئامانجێکی نوێ بکەیتەوە، ئایا بەهێزە سەبارەت بەتۆوە لەبەهادا؟

ئێستا کەپێت دەڵێم: تۆ خاوەنی پابەند بوونو پێداگریو ڕێکخستنو نەرمییەکی تەواویت لەو ڕەفتارەی وەرتگرتوە، هەنگاوێکی دواتردێت ئەویش ئارامگرتنە.

ئارامگرتن: ناتوانیت هیچ شتێك بکەیت، ئایندەیەك دروست بکەیت بەبێ ئارامگرتن، چونکە ململانێی ئاستەکەکان دەکەیت، من تۆزێك باسی

ئـــارامگریم بۆکردیـــت، دەبێـــت هۆکارەکـــان بـــەکار ببـــەیت، ڕووبـــەڕوی ئاسـتەنگەکان بیتـەوە، بـەڵام دەبێـت حەتمـەن ئـارامگری لەگەڵـدا بێـت، تـۆ پـــشتت بـــەخوای پـــەروەردگار بەســـتوە، هەمووشـــتێکت کـــردوە، بـــەڵام پـــەروەردگار ئاســـتەنگێك دەخاتـــە بـــەردەمت بۆئـــەوەی بتبینێـــت چـــۆن مامەڵـــە لەگـــەڵ گرفتەکـــەدا دەکـــەیت، بـــەئارامیت یـــان نـــا..تـــۆ دەڵێـــت: پـــەروەردگار مـــن کـــردم.. ئـــارامم گـــرت..لـــەتۆ ترســـام.. پـــەروەردگاریش دەفەرموێت:

ومن يتق الله يجعل له مخرجا ويرزقه من حيث لايحتسب

واتــە بــێ چــەندو چــوون لــەماڵ لەتەندروســتی لەکەســایەتی لەهەرشــتێك، تــۆ پارێزکـــار بویـــت پارێزکـــاریش واتـــە تـــەقوا، تـــەقوا لەئیمانـــەوە سەرچـــاوە دەگرێـــت، ئیمـــان ئەتگەیەنێتـــە گوێڕایـــەڵی، گوێڕایـــەڵی بـــۆ بێخەوشـــی‌و دڵـسۆزی، بێخەوشـی بـۆ ئەمەکـداری‌و پێـزانین، ئەمانـەش سـەرچەمیان بـۆ پەروەدگار.

پاشـان هـەنگاوێکی دیکـە ئـەویش بەدەسـت هێنـان یـان شایـستە بـوون، ئێـستا تـۆ ئامانجـەکانت بەدەسـت هێنـاوون، ووشـەی بەدەسـت هێنـان، شـیاو بـوون وەك تـۆ هـەموو شـتێکت کـردوە، مەبەسـت، ئەندێـشە، مـەرام، بـڕوا بـەخۆ بـوون، وێنـەی خـودی، جێبـەجێ کـردن‌و پـلان دانـان، پلانـی سـترا تیـژی، ئامانجـەکانت مـسۆگەر بـوون، دوای ئـەم هـەموو ماندوبوونـە بـەخۆت ئـەڵێیت: مـن شـایانی بـووم، مانـدوو بـووم‌و شـیاوی هـەموو سـەرکەوتنێکم، پـەروەردگار سوپاسـی بـێ پایـان بۆتـۆ، زۆرێـك لەخـەڵکی ئامانجـەکانیان بـەدیهێناوە وێـڕای ئـەوەش هـەر دڵخـۆش نـین، چـونکە لەسـەر بەهایـەکی بـاڵا دروسـت نـەبووە، زۆر بـەخێرایی پێیگەشـتوە، ئـیتر

هەست بەوشیاو بوونە ناکات بەردەوامیش نابێت بۆیەهەرگیز هەستی دڵخۆشبوون ناکات.

پاشان قۆناغی دواتر دێتە پێش ئەویش هاوکاریکردنی خەڵکیە..

دوای ئەوەی خوای پەروەردگار ئامانجەکانی بۆ فەراهەم و فراوان کردیت و کۆمەکی کردیت بۆ مسۆگەر کردنیان، بێگومان دەبێت هاوکاری خەڵکی بکەیت، گەربتەوێت بیرۆکەکانت بەردەوامیان لەزەمەندا هەبێت، پێویستە بیدەیتە کەسانیتر،وەك بە"زەینۆ"یان وت: تۆ یەکێکیت لەدانایانی ئەم چاخە... ئەویش وتی: من دانا نیم تاکو دانایانێك دروست نەکەم، بۆ ئەوەی بگەیتە پلەی دانایی، پێویستە دانایان دروست بکەیت، تۆ ئامانجت مسۆگەر کردووە، چیتر تۆ دەبیتە ئاڵقەی گەیاندن لەلایەن خواوە، تۆ لەخوای پەروەردگاری وەردەگریت و دەیبەخشیتە کەسانیتر، تۆبۆ ئایندەت هەموو هۆکارەکانت بەکاربرد، هۆکارەکانیش لەناخی دڵەوەن کەپێنج هەستەکانە، پشت بەخوابەستن، لەئاسودەیی دڵ و دەروونەوەیە، چونکە لەنێو دڵدا یادەوەری هەیە وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ختم الله على قلوبهم.

واتە تۆرێکی گەیشتن و پەیوەندی بەخواوە لەدڵەوە سەرچاوەدەگرێت، بۆیە گەر نەمێنێت بەوجۆرە دەفەرموێت، تۆ هەموو هۆکارەکانت بەکار بردووە ئەوانی خوای پەروەردگار بۆی فەراهەم هێناویت، لەخوێندنەوە، لەگوێگرتن لەکاسێت، بینینی فیلمی ڤیدیۆیی، ئامادە بوونی کۆڕو سیمینارەکان، سەیرکردنی بەرنامەو تۆیژینەوەکان هەموو ئەوانی لێیانەوە فێر بوویت، ئەمانەت هەموو خستۆتە مەیدانی کردارییەوە، نەخشەت بۆکێشاوە، هەڵسەنگاندووە، هەموارتکردووە، لێیانەوە

فێربوویــت، جــارێکیتر لەبێژنگتــداوە خــستوتەتەوە مەیــدانی کــارەوە، دوای ئەمانە پشتت بەخوا بەستوە، وەك پەروەردگار دەفەرموێت:

فإذا عزمت فتوكل على الله إن الله يحب المتوكلين

پــشت بــەخوا بەســتوان ئەوانــەن هۆکارەکــان بەگەڕدەخــەن، ئــەنجا پــشت بــەخوا دەبەســتن، ئــەویش ئــەمجۆرە پــشت بــەخوا بەســتوانەی خــۆش دەوێــت، کاتــێ دەســت دەگریــت بەهۆکارەکانــەوە دەچــیتە ڕیــزی پــشت بــەخوا بەســتوانەوە ئەوانــەی پــەروەردگار خۆشــی دەوێــن، دڵنیابــە خــوای پەروەدگار خۆشی دەوێیت لەدنیاو قیامەتدا سەربەرزت ئەکات....

# کۆتایی:

من زۆر سەرسام دەبم کاتێ ئەم وتەیەی شوقی دەخوێنمە:

ومانيل المطالب بالتمني ولكن تؤخذ الدنيا غلابا

ئەمەش واتا گەرتۆ لەماڵەوە دانیشیت، هیچ شتێك نەکەیت، ئەوا هیچ دەسکەوتێکت نابێت، پەندێکی ئینگلیزی دەڵێت: بیرلەهیچ شتێك نەکەیتەوە،هیچ شتێکیش نەکەیت، ئەوا هیچت دەسگیر نابێت، بەهیچیش نابیت....

ئێستا با لێت بپرسم: ئایا دەکرێت هەموو ئەمانە بکەیت و نەتوانیت ئامانجەکەت مسۆگەر بکەیت؟

بێگومان دەکرێت! چونکە گەر ئامانجەکەت مسۆگەر نەکەیت ئەوا دوهۆکارت لەبەردەمدا بوون:

یان هۆکارەکانت بەکاربردون بێئەوەی بگەڕێیتەوە بۆلای ڕەخسێنەری هۆکارەکان واتە پەروەردگار، یان توشی لوتبەرزیو غرور بویت، چونکە سەرکەوتن دەکرێت بتگەیەنێتە سەرکەوتن، یان بەرەو هەڵدێرت ببات، ئەم هەڵدێرە خوازراوە، بۆئەوەی بیرلەتوانا ڕاستەقینەکانت بکەیتەوەئەوانەی خوای گەورە پێی بەخشیویت بۆ ئەوەی بەرەو لای خوای گەورە بگەڕێیتەوەو پشتی پێبەبەستیت یارمەتی زۆرینەی خەڵکی بدەیت، چونکە لەیاریدەدانی هەرکەسێکدا هەستی کامەرانی نەکەیت هاوکات خوای گەورە زیاترو زیاترت پێدەخشێت، بەدرایژایی

گەشتەکانت بەسەر دنیادا پێویستە بزانیت تۆ کێیت بزانیت تۆ باشترین بەدیهێنراوەکانی خوای پەروەردگاری، هەمیشە بەهای خۆت بزانە.

جارێکیان ڕاوچییەك ڕاوی شتە سەیرو سەمەرەکان دەکات، ڕاوی مانگایەکی شێوە نامۆ دەکات، یان ئاسکێکی ژیکەڵە دەیانبات‌ەوە پەروەردەیان دەکات، ڕۆژێکیان ڕێی دەکەوێتە سەرشاخێك، هێلکەی داڵێك ئەدۆزێتەوە، دەیەوێت تاقی بکاتەوە، دەیهێنێت‌و تێکەڵی هێلکەی مریشکێکی بەکڕی دەکات، دوای ماوەیەك مریشکەکە هێلکەکان هەڵدێنێت، هاوشان هێلکەی داڵەکەیشی تێدایە، بێچوەداڵەکە وادەزانێ مریشکەکە دایکی ئەویشە، وەك جوجکەکان دێتە دەرو چینە دەکات، دەنوك لەزەوی ئەدات‌و دانەوێڵە ئەخوات، دەیەوێت وەك جوجکەکان بجوکێنێت بەڵام ناتوانێت، چونکە دەنگی لەدەنگی ئەوان زۆر جیاوازتر، ڕۆژێکیان باڵندەیەك بەئاسمانەوە دەبینێت ڕەگێکی زێرینی هەیە، دوباڵی درێژی هەیە، زۆر بەئاسانی دەفرێت بەئاسماندا، سەیرێکی دەکات‌و بەخۆی دەڵێت:تۆ بڵێی منیش وەك ئەو بتوانم بدەم لەشەقەی باڵ‌و بفرم؟ هەموو مریشکەکان لێی دێنە دەنگو پێی دەڵێن: وسبە وس...لێی دور بکەوەرەوە، چونکە ئەوەداڵە ئەتخوات، بۆیە لەگەڵ مریشکەکاندا هەڵدێت، بەڵام شتێك لەناخەوە پێی دەڵێت: بۆ وەکو ئەوباڵندەیە ناکەیت؟ بەخوا دڵم پێم ئەڵێت دەتوانیت وەك ئەوباڵندەیە تۆش بفریت، بۆیە بەیانییەکیان زوو ڕاپەڕی، سەیرێکی باڵندەکەی ئاسمانی کردوو ویستی لاسایی بکاتەوە باڵەکانی وەکو ئەو کردەوە سەیرێکی خۆی کردو وتی: منیش وەك ئەو باڵەکانم درێژن، خۆ من لەمریشکەکان ناچم! زۆر لەوان گەورەترم بیرێکی تری کردەوە بازێك

بدات، مریشکەکان بۆی هاتن پێیان وت: بۆ بڕوا بەخۆت ناکەیت کەتۆش وەك ئێمە مریشك بیت؟ ڕاکە بادالەکە نەتخوات، بەلام ئەم گوێی بۆ قسەکانی ئەوان نەگرت بەردەوام بوو لەسەر بازدانەکانی خۆی بۆ فڕین، مریشکەکان پێی پێدەکەنین و گاڵتەیان پێدەکرد، بەلام ئەم لەهەوڵدانەکانی دەستبەردار نەبوو تاکو دای لەشەقەی باڵو توانی بفڕێت، دڵنیا بوو لەوەی ئەم مریشك نییەو داڵە،، منیش ئەمەم لەتۆ دەوێت بەلام تۆ داڵ نیت بەڵکو جوانترینو باشترین بەدی هێنراوی پەروەردگاریت، مەهێڵەمریشکەکان گاڵتەت پێبکەن، وریابەو ئاگاداری ئەوانە بە خەونەکانت دەدزن، مەهێڵە بکەویتە ژێر کاریگەری قسەو قسەلۆکی خەڵکیەوە، هەرچۆن ئاستەنگ بێنە ڕێت لەلایەن خوای پەروەردگارەوەیە، هەرچەندیش خۆڕاگرو ئارامگربیت خوای گەورەش زیاترو زیاترت بۆ فەراهەم دێنێت.

وتەیەکی هۆمیرۆس دەڵێت:

پێویستە مرۆڤ هەوڵ و کۆشش بکات تاکو خوا سەرکەوتن بکاتە یاوەری. بەدرێژایی تەمەنت لەڕیزی چاکەکاراندابە وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ولا نضيع أجر المحسنين...

خوای گەورە خەڵاتی چاکەکاران دەکات چونکەبەخشندەو چاکەکارن، هەمیشە خۆت بخەرە قۆناغی کرداریەوە، خۆت بخە ڕیزی تێکۆشەرانەوە، تاکو کۆشش زیاتر بکەیت پەروەردگاریش زیاترت پێدەبەخشێت، وەك پەندێکی عەرەبی دەڵێت: هەرکەس بەدوای هەرشتێکدا بگەڕێت دەسگیری دەبێت... تۆ خۆت ماندوو دەکەیت

پــەروەردگاریش ناهێڵێــت ماندوێتیەکــەت بەهــەدەر بــچێت، الله لایـضیع أجـر من احسن عملا

موتەنەبی دەڵێت:

على قدر أهل العزم تأتي العزائم وتأتى على قدر الكرام المكارم

وتعظم في عين الصغير صغارها وتصغر في عين العظيم العظائم

بــەردەوام هەرچــیەك لەژیانتــدا ڕوبــدات بەهۆیەکەوەیــە ئــەم هۆیــە خزمــەتت ئەکات..

ئێـستا بــەر لــەوەی بێمــە کۆتــایی دەمــەوێ ســتراتیژیەکی جوانــت پێبــدەم، چــۆن هەســـت بـــەخاو بونەوەدەکـــەیت ئایندەیـــەکی جـــوانیش بۆخـــۆت دروست دەکەیت؟

هــەمو کارەکانــت واز لێبێنــەو جارێــك ئــەم دێڕانــە بخوێنــەوە پاشــان تــەنها خۆت پێی هەستە.

هەناســـەیکی قـــوولَ بەچـــوار کـــەڕەت هەڵمـــژە، پاشـــان بەهەشـــت کـــەڕەت لەلوتـــەوە بیـــدەرەوە بەهێواشـــی، بەهێواشـــی ماســـولکەکانی چـــاوت خـــاو بکـەرەوە، لەپەنجـە گـەورەی قاچـی ڕاسـتەوە ئـەنجا پەنجـە گـەورەی قاچـی چــەپت، هەســت بــەخاو بونــەوەیان بکەهەســت بــە حەوانەوەیــە بکەبــەرەو ئـــەژنۆکانت ســـەردەکەوون، ئـــەژنۆی ڕاســـتت بحەوێنـــەوە، هەســـت بەخاوبونــەوەی تــەواوی بکــە، ئــەژنۆی چــەپت بحەوێنــەوە، هەســت بــەخاو بونــەوەی تــەواوی بکــە، هەســت بــەو خــاو بونەوەیــە بکەبــەرەو ســینگت هەڵدەکـشێت بەهێواشـی، دەسـت بـدە لەهــەموو بەشـێکو ماسـولکەیەکی لەشــت تادەگاتــە ســکت، ســکت بەتــەواوی بحەوێنــەوە لــەناوەوە لــەدەرەوە هەســت بــەخاو بونــەوەی بکــە، هەســت بــەو ئاســودەییە بکــە کەئێــستا

دەگاتە سینگت، هەست بکەسینگت تەواو خاو بۆتەوە، شانی ڕاستت بحەوێنەوە، هەست بەخاو بونەوەی بکە، شانی چەپت بحەوێنەوە، هەست بەخاو بونەوەی بکە، باڵی ڕاستت بحەوێنەوە، هەست بەخاوبنەوەی بکە، باڵی چەپت بحەوێنەوە، هەست بەخاو بونەوەی بکە، پەنجەکانی دەستی ڕاستت بحەوێنەوە، هەست بەخاوبونەوەیان بکە، پەنجەکانی دەستی چەپت بحەوێنەوە، هەست بەخاوبونەوەیان بکە، هەست بەو ئاسودەییەی گەروت بکە، بچۆرە سەر دەمو چاوو ڕوخسارت، هەموو بەشێکی دەمو چاوت بحەوێنەوە هەست بەخاوبەنەوەیان بکە، ئەنجا ئاسودەیی بگەینە سەرت هەموو ئەندامەکانی لەشت باخاوبینەوە.

ئێستا دەمەوێ وابزانیت لەدەپلەی پلیکانەیەکەوە دابەزیویت بەهێوری هەموو پلەیەك زیاترو زیاتر خاوت دەکەنەوە، تالەکۆتاییدا هەست بەخاوبونەوەیەکی سەرتاسەری ئەکەیت، لێرەدا دەبینیت دەرگایەك لەبەردەمتدایە، تۆ دەزانیت شێوەی ئەودەرگایە چۆنە، مەرج نیە دەرگاکە بەوردەکاریەکانەوە ببینیت، بەڵام شێوەی دەرگاکە بەچاکی دەزانیت، لەدیو ئەم دەرگایەوە ڕێگەیەك هەیە دەتگەیەنێتە ئایندە... دەرگاکە بکەرەوە، ڕوناکیەك دەبینیت هێورکەرەوەی جەستەو دەمارەکانو دەرونتە، دەسبەکاربەو برۆ بەڕێگەیەدا ڕۆژانو ساتەکانو خولەکەکان لەبەر تیشکی ئەم ڕوناکیەکیەدا دەڕۆن، هەرهەنگاوێك هەڵدەگریت ئامانجێك دەپێکیت، هەموو ئامنجێك بەئامانجێکی دیکەت ئەگەیەنێت، زیاتر گرێت ئەداتەوە بەمەبەستو ئەندێشەکانەوە، دەبینیت مەرامەکەت بەهێز دەبێت، زیاترو زیاتر برۆ تادەگەیتە

خەونـەكانت ئامانجـەكانت بـەدی دێنیـت، بـەلای ڕاسـتدا سـەیرێكی دواوە بكـە، ئـەو سـتراتیژانە دەبینیـت كـەبۆ بـەدیهێنانی مەبەستەكانت بـەكارت هێنـاوون، دەڵێـت: سوپاسـی بـێ پایـان بـۆ پـەروەردگار، سـەیرێكی لای چـەپت دەكـەیت، ئـەو ئاسـتەنگانە دەبینیـت كەبەسـەریاندا تێپـەڕیویت چـۆن توانـا تێپەڕانـدنیانت هـەبوو، لێرەشـدا دەڵێیـت: سوپاسـی بـێ پایـان بۆ پەروەردگار، ئێتر ئێستا تۆ ئامانج و خەونەكانت بەدەست هێناوە.

سەرنج بدە:

تـۆ ئێـستا لـەكوێیت؟! چـی لەبەردەكـەیت؟! كـەش و ئـاوو هـەوا چـۆنە؟! چـی دەبیـستیت؟! هەسـت بەچـی دەكـەیت؟! لێـرەوە وێنەیـەكی گـەورە بۆخـۆت دروسـت بكـە، هـەموو ئەوڕەنگانـەی تێبكەكـەپێت خۆشـە، هەرچـۆنێك پێباشـە ڕونـاكی بخـەرە سـەر وێنـەك، بـەئارەزوی دڵـی خـۆت گەورەی بكە.

ئێستا:

كـارێكی وابكەبـچیتە نـاو وێنەكـەوە، هەسـتی پێبكـەیت، لەناویـدا هەناسـە بدەیت، تاكو لەگەڵ وێنەكەدا دەبیتە یەك.

ئێستا:

لەوێنەكـەوە وەرەدەرەوە، لێگـەڕێ بـا كـەف و كـوڵی بەسـەرتدا بڕژێـت، ئەوجا سێ جار بڵێ: الحمد لله... الحمد لله... الحمد لله.

پاشـان بگـەڕێوە بـۆ ڕێگەیـەی لێـوەی هاتیـت، خولەكـەكان، چـركەكان، سـاتەكان، ڕۆژەكـان، بگـەڕێوە بۆشـوێنی خـۆت، لێـرەوە تەماشـای ئـەوێ بكـە، دەبینیـت وێنەكـەت بەرجەسـتە بـووە، مەبەسـتەكەت بەرجەسـتە بـووە، لێـرەوە برانـەو بڵـێ: تـەنها مەسـەلەی كاتـە، بەویـستی

پەروەردگار مەبەستەکەم دێنمە دی، پاشان لەهەمان دەرگاوە بچۆرەوە ژورەوە، ئەوەی لێی هاتیتە دەر، ئەو دەپلەیە دەبینیت کەلێی دابەزیت، بەهەر پلەیەکدا سەرکەویت بەهاو مانای خۆی هەیە، بەپلەی یەکەمدا سەرکەوە ئەوپلەیەی خۆپێ پەسەندبون، هەست دەکەیت تۆ خۆتت بەتەواوی پێ پەسەندە، ئاستەنگو پێش هاتەکان هەرچیەك بن، یان قسەو قسەلۆکی خەڵکی، تۆ بەتەواوی خۆتت پێ پەسەندە، دەزانیت تۆ باشترین بەدی هێنراوی خوای پەروەردگاریت، پلەی دووەم، ئەویش وێنە خودیەکەتە، لێرەدا خۆت پەروەردە دەکەیت بۆ مسۆگەر کردنی ئامانجەکەت، بەپلەی سێیەمدا سەردەکەویت، ئەویش خۆ نرخاندنە، خۆتو ئەزمونەکانت هەڵدەسەنگێنیت، بەپلەی چوارەمدا سەردەکەویت ئەویش بڕوات بەتواناکانی خۆت بۆ بەهێز دەکات، بەپلەی پێنجەمدا سەر دەکەویت، ئەویش شایستەیی خۆتت بۆدەردەخات کەتۆ شایانی بەدیهێنانی خەونو ئامانجەکانی خۆتیت، بەپلەی شەشەمدا سەردەکەویت ئەویش، حەزە، حەزێکی ئاگرینت بۆ دروست دەبێت، بەویستی پەروەردگار دەتگەیەنێتە لوتکە، بەپلەی حەوتەمدا سەر دەکەویت، ئەویش تواناکانتە، لێرەدا ڕۆژانە تواکانی خۆت ئەبینیتەوەو سڵ لەهیچ شتێك ناکەیتەوە، بەپلەی هەشتەمدا سەر دەکەویت، فێری ستراتیژەی نوێ دەبیت تاکو تواناکانت لەکرداردا بەکار ببەیت، بەپلەی نۆیەمدا سەر دەکەویت، ئەویش متمانەیە، متمانە بەخۆبونت ئێستا لەبرەودایە لەهەر کاتێکی دیکە، بەپلەی دەیەمدا سەر دەکەویت، ئەویش وزەی ڕۆحانییە، دەبێت هەموو وزە ڕۆحانیەکانت بەرەو پەروەردگاربن بەتینی دڵو دەرونو گیانەوە.

ئێستا :

هەناسەیەکی قووڵ هەڵمژە، لەگەڵ دانەوەیدا بڵێ سوپاس بۆ پەروەردگار سێ کەرەت، چاوەکانت هەڵبێنەوە، هەموو ڕۆژێک بەرلەنوستن کەمێك ئاو بخۆرەوە، هەناسەیەکی قووڵ هەڵمژە بەهێواشی بیدەرەوە، چاوەکانت لێك بنێ لەناخەوە بەخۆت بڵێ: من ئەتوانم ئامانجەکانم بەدی بێنم بەویستی پەروەردگار...

من ئامانجەکانم بەدی دێنم، خەونەکانم بەدی دێنم بەویستی پەروەردگار، مەبەستەکەم ئاشکرا دەکەم، پەروەردگار دەمپارێزێت، ڕێنموونیم دەکات بۆرێگەی چاك لەهەموو کاتێك لەهەموو شوێنێك، منیش لەخوای گەورە دەپاڕێمەوە بەتواناکەم ئایندەیەی پرشنگدار بۆخۆم دروست بکەم، من بڕیامداوە تواناکانم بەئاگا بێنمەوە ئایندەم دروست بکەم...

لەکۆتاییدا:

بەردوام لەیادت بێت:

هەموو چرکەیەکی ژیانت بەجۆرێك بژی وەك دوایین چرکەی ژیانت بێت، بەخۆشەویستی خواوە بژی، بەڕەوشتی پێغەمبەرەوە بژی، بەتێکۆشانەوە بژی، بەخۆشەویستیەوە بژی، بەهای ژیان بزانە.

# دکتۆر ئیبراهیم ئەلفەقیٚ
# لەچەند دێڕێکدا

د. ئیبراهیم ئەلفەقیٚ:

- دامەزرێنەرو سەرۆکی ئەنجومەنی کۆمەڵگەی کۆمپانیاکانی ئیبراهیم ئەلفەقیٚ.

جیهانیە کەپێکهاتوون :

- مەڵبەندی کەنەدی بۆگەشەی مرۆییCTCHD
- مەڵبەندی کەنەدی بۆ هێزی وزەی مرۆیی CTCPHE
- مەڵبەندی کەنەدی بۆخەواندن بەئاماژەCTCH
- مەڵبەندی کەنەدی بۆداتای زمانەوانی دەماری CTCNLP
- دانەرو دامەزرێنەری زانستی دینامیکی چاندنی دەمارNeuro Conditioning dynamic(NCD)
- دانەرو دامەزرێنەر زانستی هێزی وزەی مرۆیی Power Human Energy
- پسپۆڕی جیهانی ڕاهێنەری بڕوا پێکراولە:
- داتای زمانەوانی دەماری.
- خەواندنی موگناتیسی .
- ئەنبار کردن .
- ڕیکی.

ڕاهێنەرو بڕواپێکراوی گەشە مرۆییەکانە بۆ کۆمپانیاو دامەزراوەکانی حکومەتی کیبیك لەکەنەدا .

- دکتۆرای هەیە لەزانستی میتافیزیك لەزانکۆی لۆس ئەنجلوس لەوڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا.

- بڕوانامەی شەرەفی یەکەمی بەدەست هێناوە لەبەڕیوەبردنو فرۆشیاریو بازاڕەوە لەدامەزراوەی ئەمریکی بۆ هۆتێلەکان .
- ٢٣ بڕوانامەی دبلۆم، سیان لەپسۆڕی بالا لەگەشەی مرۆیی بەڕێوەبردنو فرۆشتنو بازاڕ.
- جێگری بەڕێوەبەری گشتی هەندێك لەهۆتێلە پێنج ئەستێرەییەکانی مۆنتریالی کەنەدیە.
- خاوەنی کۆمەڵێك دانراوە کەوەرگێڕراونەتە سەر پێنج زمانی ئینگلیزی، فەرەنسی، عەرەبی، کوردی، ئەندۆنیزی، پرفرۆشترین دانراوی جیهانین.
- پێگەیەنەری ٨٠٠ هەزار کەسە لەسیمینارو خولەکانیدا، وانە بیژو ڕاهێنەرە بەسێزمانی جیهانی ئینگلیزی، فەرەنسی، عەرەبی.
- پاڵەوانی پێشوی کۆماری میسریە لەیاری تێنسداو لەساڵی ١٩٦٩ لەسەر ئاستی جیهانی پاڵەوانێتی بەدەست هێناوە لەئەڵمانیا.
- ئێستا لەگەڵ خێزانەکەی أمال ئەلفەقێ، هەردوکچە دوانەکەی نانسیو نەرمین نەوەکانیان مالكو زیادو کایلاو جەنەت لەمۆنتریالی کەنەدا دەژین.

**چی دەڵێن لەبارەی ئیبراهیم ئەلفەقێ وە:**

- بەڕای من دکتۆر دکتۆر ئیبراهیم ئەلفەقێ باشترین وانە بێژی جیهانییە..

بنادێت دیکارت بێژەری-ک ب ل- لویزیانا ولأتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

- زیاتر لەقەشەنگی سەلیقەیەکی دەگمەنی لەپێشکەشکردندا هەیە..

دکتۆر کلیمنت جونسون-پزیشک- تکساس- ولأتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

- چێژبەخش و بەتوانیەبەهێزو خێراییەک دەگاتە مێشکی گوێگرەکان پێشینەی نیە

کریستیان ماکدونالد-بەرپرسی ماپرز-مونتریل-کەنەدا.

- دکتۆر ئیبراهیم ئەلفەقێ فێری هونەری ژیانی کردم، ڕێگەی بەختەوەی بۆ ڕوناک کردمەوە.

میشێل جوپان-نوسەری ڕۆژنامەی لەکولیبت-مونتریال -کەنەدا.

- کۆڕەکانی دکتۆر ئیبراهیم ئەلفەقێ، ئەزمونەکانی تەمەنن، هەمووکەسێک دەبێت فرسەتی چونە کۆڕەکانی ئەوی هەبێت.

روز سولازو- مونتریال- کەنەدا

- دکتۆر ئیبراهیم ئەلفەقێ ڕێگە ژیانێکی تری بۆ ڕوونکردمەوە.

سوزیت جورجدو- کۆمپانیای فرۆکەوانی - کەنەدا.

- دەگمەنەو بێوێنەیە، بەیەکێک لەوانەبێژە جیهانیەکان هەژمار دەکرێت.

فرانس مارتل- بێژەر- تەلەفیزیۆن-کیبیک- کەنەدا

- دکتــور ئیــبراهیم ئەلفــەقێ.. تــوانی لــەماوەی هەشــت کاتـژێردا، خولیایـەکی بێوێنـە لـەناخی ئامادەبوانی دروسـت بکـات، هـەروەها تـوانی ئەندێشەو ڕێگاکانیـان بـۆ ڕونـاک بکاتەوە، کاریگەریەکی وای لەسەرمان دروستکرد لەناخەوە خۆشمان بوێت پەیوەست بین پێیەوە، ئەم هاوکێشەیەش لەوپـەڕی فورسـیدایە، هـەرگیز کەسـم نـەدیوە بتوانــێ لەماوەی یەک ڕۆژدا هێندە سەرکەوتو بێت.

اودیت اسکندر-سەرۆکی ئەنجومەنی کۆمپانیای میسرو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست- میسر

- دەگمـەن‌و جیـاوازە، شـێوازێکی دڵڕفێنـی هەیـە، کۆرەکـەی چویە ناخی دڵمەوە، ڕێڕەوی ژیانی گۆڕیم.

عیزەت فرحات- بەڕێوەبەری دڵهاتە مرۆیەکان-جونسون واکس -میسر.

- دکتۆر ئیبراهیم ئەلفەقێ، ژەنیارێکی تایبەتـە، ئەستی مـرۆڤ پـڕ دەکـات لـەوزە، بزوێنـەری خەڵکـەبۆ لـەوجی ژیـانێکی دینامیتی بەرەو بالآ.

ڕۆژنامە نوس -مونا عبدالجلیل-کویت.

- زۆر دەگمەنـە، لـەو بـاوەڕەدا نـەبووم، هێنـدە خـاکی بێـت، هێندە گرنگی بدات بە ڕاهێنراوەکانی خۆی.

عبدالله حارس رومەیسی- سەرۆکی بەڵنی مۆزیک- کەناڵی تەلەفزیونی دوبەی- ئیماراتی یەکگرتوی عەرەبی.

- دکتۆر ئیبراهیم ئەلفـەقێ، جێگـەی شانازی هـەردو نەتـەوەی عەرەبی‌و ئیسلامیە.

هەیسەم عبدالغنی- جێگری بەڕێوەبەری گشتی- کۆمپانیای سعودیە. هێنان‌و بردنی کاغەز- شانشینی عەرەبی سعودی.













کچێکی تەمەن 19 ساڵ سەردانی کردم بۆ نوسینگەی ڕاوێژکاریەکەم، دەگریا، گریانێکی نائاسایی، کاتێ باسی باوکی دەکرد تەنانەت وتی: زۆر ڕقم لێیەتی، بەرگەی ناگرم، خۆکوژیم پێباشترە لەم حاڵەم، زۆریش هەوڵی خۆکوژیداوە لەبەر توندو تیژی باوکی. جارێکیان چاوم بەباوکی ئەو کچە کەوت لەیەکێک لەکۆڕەکانمدا، هەرکەبینیمی دەسپێشخەری کردو وتی: زۆر پێویستم بەتۆ هەیە بۆ ئەوەی هاوکاریم بکەیت لەو کێشەیەدا، من دەمەوێ زیاتر لەکچەکەم نزیک بمەوە، بەڵام ئەو ڕوم تێناکات منیش ناتوانم بەوجۆرە مامەڵەی لەگەڵ بکەم. بڕوانە ئەو دەیەوێ بەوپەڕی توانایەوە ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات لەهەموو حاڵەتێکیدا ئەو باوکە. کچەکەش حەزی لەدورکەوتنەوەیە، حەزی بەچونە دەرەوەیە حەزدەکات درەنگ بچێتەوە بۆ ماڵ، بیری ڕاستەقینەی نەدەکردەوە، لەوانەکانیدا دەرنەدەچوو، چاوەڕوانی هیچ شتێکی ئەرێی نەدەکرد تەنها لەنەرێکان پێشوازی دەکرد، گوایە باوکی دەیەوێت کۆتو بەندی بکات، یان توندو تیژ بێت لەگەڵیدا.






لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا